# ئەخلاص
# بە
# کوردی

## زنجیریك لە كردە وە كانی دل



نووسینی:

محمد صالح المنجد

وە رگیرانی:

قاسم محسن عولا

١/٤/٢٠٢٣م ١٠/رمضان/١٤٤٤ه

## پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

السلام عليكم ورحمة الله تعالى وبركاته.. الحمد لله حمدًا كثيرًا طيبًا مباركًا فيه، الحمد لله الذي علم بالقلم علم الإنسان ما لم يعلم، وأفضل الصلوات وأتم التسليم على سيدنا وحبيبنا محمد خير البرية وخاتم الأنبياء والمرسلين والذي أنقذ برسالته عباد الله من ظلمات الجهل وأهداهم بفضل الله إلى طريق الحق .

سلاو رحمە ت و بەرکەتی خوای گەورە تان لەسەر بیت , سوپاس وستایشی زۆر بۆ خوای بەرز پیرۆز ، سوپاس بۆ ئەوە خوایەی کە بە پینووس یان قەلە م فێری کردووین ، کە مرۆڤ فێر بوو پێشتر هەر گیز نەیدازانی ، باشترین درودوو سلاو وە تەواو ملکەچی بۆ پێغەمبەری پێشەوایی مرۆڤایەتی کە گەورە سەرو وەر قائید و خوشەویستمان کە چاکترین مرۆڤی سەر زەوی ، کە لە دواین پێغەمبەران بووە ، وە پە یامەکەی بۆ بەندە کانی (خوای گەورە) رزگار کەر بوو ، بۆ تاریکی و نەزانی و نەفامی ، وە رینموویی کردووین بە فەزل و نازونیعمەتی خوای گەورە بۆ ریگای راست و درووست حەق .

بەلی بە پشتیوانی (خوای گەورە ) ئەم پە روتووکەم وەرگێرا بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی کە نووسەری ئەم پەرتووکە (شیخ محمد صالح المنجد) خوا بیپاریزی و برکەت بخاتە زانستەکەی ، کە زنجرێك لە کردە وە کانی دل ، ئەویش پەرتووکی (ئە خلاص ) یان دلسۆزی ، بەلی یەکەمین کردەوە دل سۆزیە چونکە کرۆکی پەرستن و رووحی پەرستنە ، بنچینەی پەسەند بوونی کردەوە کانە و وە لامدانەوەی کردەوەکانە ، دل سۆزی گریگ ترین کردەوەکانی دل دە روونە وە لە سەرووی هەموانە بناغە و بچینەی هەموو کارو کردەوەیەکە ، بی گومان کلیلی بانگەوازی هەموو پێغەمبەران بووە (عليه السلام )

# مانای ئەخلاص

## ئەخلاص لە رووی زاراوەی زمانەوانی

وەرگیراوە لە فەرمانی ( أخلص ) وە لە فەرمانی رانە بردوو دا (يخلص ) وە لە چاوگی یان سەر چاوەی (إخلاصا) وە رگیراوە واتا : پوختە کرنی شتیك یان پوختە کردنی شتیك کە هیچ پیس و پۆخەلیکی تیکەل نەکراوە ، وە ئەوەی کە پیاویك دلسۆزە بۆ ئاینی خوا ، دل سوۆزی بۆ خوا کە هیچ ئاینیکی تری بدعە یەکی تیکەل بە ئاینی خوا نە کردووە جگە لە ئاینی خوا نەبیت ..؟!

هەروەك خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴾ الحجر ٤٠ واتا : بیجگە لە بەندە پوختوو دل سۆزەکانی خۆت نەبیت چونکە دلیان بە باوەر بە تۆ و یادی تۆ ئاوەدانە ، هەول کۆششی من بۆ ویل کردنیان ناکەمە.

ثعلب -رەحمەتی خوای لی بیت - دەلیت : واتایی (المخلصين ) پوخت کردنی پەرستنی خوای گەورە ، مخلصين بە تەنها خوا پەرستی بۆ بکەی بە پوخت پی تیکەل بوونی هیچ شتیك ..!!

**الـزجـا ج** –رحمەتی خوای لی بیت - دەلیت : (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مُوسَى إِنَّهُ كَانَ مُخْلَصًا﴾ مريم ٥١ . واتا : یادی موسا باس بکە لە قورئاندا ، بەراستی ئەویش کەسیکی هەلبژاردە و دلسۆزی فرستادە بووە .. زجاج دەلیت : خودا تاکە پوختە ، هەروە ك لە سورەتی ئەخلاص دا دەفەرموویت : ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ الاخلاص ١ . واتا: ئەی **محمد** ﷺ بەئیماندارن بلی : ئەو خوا یەی کە ناوی (الله ) خوایەکی تاك و تەنهایە بی هاوەل و هاوتایە.

**الابـن كـثـير** -رحمەتی خوا لی بیت دە لیت : بۆیە ناونراوە چونکە پوخت و پاکە لە سیفە تی خوای گەورە دا پیرۆز کراوە ، یان دەربرنی دلسۆزی یان پوخت بوون یەك خوا پەرستیە یان (التوحيد الله ) ..!!

شتی پوخت : ئەوە پاك و بیگەردە چونکە هەموو تیکەل بوونیکی لابردووە یان هیچ عیب و عاریکی نەماوە تیکە لاوی هیچ عیب و عاریك نەبووە یان هیچ شتیکی بیریزی تیدا نیە [1] .

**الـفـيـروز آبـا دي** -رەحمەتی خوالی بیت دەلیت : (اخلص الله ) دل سۆزی بۆ خوا : وازهینان لە ریایی کردنە لە گویرایەلی خوا پەرستی کردن ، واتا : هیچ خوا پەرستیە ناکات بە ریا و ئاشکرا جگە لە سرو نەهینی نەبیت لە نیوان خوی خوای گەورە دا بە دل سۆزی تەنها بخوا عیبادەت دەکات نەك ریایی کردن . [2]

---

١- لسان العرب (٧/٢٦) وتاج العروس (٤٤٣٧) .

٢- القاموس المحيت(٧٩٧).

الـجـرجـانـي -رەحمەتی خوا لی بیت - دەلیت : ئە خلاص لە رووی زمانە وانی بە واتای : وازهینان لە ریا کردن لە گویرایەلی فەرمانەکانی خوا بە دل سۆزی بە نهینی خوا پەرستی و فەرمانە کانی جی بەجی دەکات بە نیەتیکی پاك تەنها بۆ خوا نە ك ریا کردن بۆ خەلك . [٣]

---

[٣]_ التعريفات (٢٨)

## ئەخلاص لە رووی زاراوەی شەرعیەوە

زانایانی ئاینی ئیسلام پیرۆز پیناسەی زۆری ووشەی ئەخلاصیان کردووە ، وە هەندیك لەو پیناسانەی کە زۆر گرینگن ئەمانەن:

ابن القیم – رحمەتی خوا ی لی بیت - دەلیت : ( ئە خلاص : بریتیە لە خوا بە تەنها پەرستن و بە حەق زانین و بە مەبەست و گویرایەلی کردن لە فەرمانە کاندا بەراست و دروستی . )[٤]

الجرجاني - رەحمەتی خوای لی بیت - دە لیت :( ئە خلاص : بریتیە لە پاك کردنەوە دل لە پیسی نا تەواویی و پۆخلی بۆ روونیە کەی یان صافیە کەی ، وە لە هەموو شتیك خیال دە کریت یان تصور دەکریت کە تیکە ل بە بەشتیکی ترە ، وە ئەگەر روون و پاك بیت تیکەل نە بیت بە شتی نا پوخت پیس ئەوا پوخت دەبیت ناو نراوە (خالصا ) پاك روون بیگەرد صاف، وەك فەرمانی (المخلص ) إخلاصا ، خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ﴾ النحل ٦٦ .

واتا : لە گژو گیایی هەرس کراوو خویندا ،شریکی پاك صاف و بیگەرد و خۆش و بە تام بەر هەم دەهینین بۆ ئەوانەی دەیخۆونەوە ..!! .بەلی : لە گژو گیا تیکە ل خویندا شریکی صاف پوخت بەر هەم دەهینریت .[٥]

---

[٤]_ مدارج السالكين (٢/٩١).

[٥]_ التعريفات (٢٨) .

**دەڵێن:** ئەخلاص : بریتیە لە پالاوتنی کردەوە کان لە شتە نارۆونە کاندا . [6]

**(حذيفة بن المرعشي)** -رەحەتی خوای لێ بێت- دەڵێت : ئەخلاص : بریتیە لە پێگەی کردەوە ئاشکراوە نهێنیە کانی ناوەوەی بەندە . [٧]

**وە هەندێك دەڵێن :** ئە خلاص : ئەوە یە کە لە سە ر کارو کردەوە کانت هیچ شایەتێك دوا نەکەیت جگە لە (الله) وە داوای پاداشت و جزا نەکەیت لە هیچ کە سێك جگە لە (الله) . [8]

**وە وتراوە :** خۆپارێزی لە سەرنجدانی خەڵکی و تە نانەت لە نەفس خۆت بۆ کار و کردەوە کان

(صدق)یان راستیش بریتیە لە خۆ پاککردنەوە یان خاوێن کردنەوە لە خوێندنەوەی نەفسی خۆت ، مرۆڤی موخلیص یان دڵ سۆز ریایی نیە کە سی راست گۆ یان صادق خۆ پەسەندی نیە ، ئەخلاص یان دڵ سۆزی تەنها بە صدق یان راست گۆیی دەستەبەر دەبێت ، وە هەروەها بوونی صدق و راستگۆیی تەنها بە دڵ سۆزی و ئەخلاص سەر هەڵدەدات ، هەردووکیان واتا : راست گۆیی دڵ سۆزی بەئارام گرتن تەواو کامل دەبێت . [٩]

---

[٦] ـ التعريفات (٢٨) .

[٧] ـ التبيان في آدب حملة القرات (١٣).

[٨] ـ مدارج السالكين (٩٢/٢) .

[٩] ـ مدارج السالكين (٩٢/٢) .

**ووتـراوە : ئە خلاص بریتیە لە هاوتا بوونی کارو کردەوەکان لە دەرەوە و ناوەوە ، بەلام (ریا ) ئەوە یە کە دەرەو باشتر دەبیت لە ناوەوە دا ، راست گۆیی لە دل سۆزی دا ئەوە یە ناوە وەی ئاوەدان ترو باشتر بیت لە دەرە وەی.**

(ابـو سـلـمـان دارانـي) : دەلیت : کاتیك بەندە دەگاتە ئەخلاص ، ئەوا (وەسوەسە و ریا) لی جیا دەبیتە وە .

جـونـەیـد : دەلـیـت : ئیخلاص نهینیەکە لە نیوان خوای گەورە و بەندە دا ، فریشتە کان پی نازانن بی نووسن ، شەیتانەکان پی نازانن لی تیك بدان ، ئارەزووی خۆی پی نازانیت خوارو لاری بکات

بـە سـەهـل ووتـرا : چ شتیك زر لە سەر نەفس گرانە ..؟! ووتی : ئیخلاص چونکە بەشی نەفسی تیدا نیە.

مەحکول : دەلیت : هەر بەندەیەك چل رۆژ بۆ خوا دل سۆزبیت یان ئیخلاصی هەبیت ،ئەوا کانیاوی حکمەت لە دلّ و لەسەر زمانی هەلدە قولیت .

# ووتەی هەندیك لە زانایان پیشینە چاكە كانی (سلف صالح ) دەربارەی ئەخلاص

ئیخلاص : كردەوەیە كە تەنها بۆ خوایە گەورە یە ،وە بۆ هیچ كەسیك نیە جگە لە خوای گەورە .

ئیخلاص : پۆلین كردنی كردەوەیە لە تبینی رخنە لە نفسی خۆت یان لە بوونە وەرە كان .

ئیخلاص : پۆلین كردنی كردوە یە لە خەوشو خال پیسی ناو دلّ و دە روون .

مخلیص یان دل سۆز : ئەو كەسەیە كە گرنگی پی نادا ئەگەر هەموو چارە نووسە كەی خۆی لە دلی خەلكدا بیت ئەو تەنها لە پیناوی ئەوە دایە چاك كردنی دل خۆی لە گەل خوای گەورە دا ، وە حەز بەوە ش ناكات كە خەلكی زەریك لە كردەوە كانی پیوانە بكەن ، چونكە تەنها مەبەستی پیوانە كردن و كیش كردنی كردەوە كانی لە لایەن (خوای گەورە ) بیت نە ك خەلك كردەوە كانی پیوانە بكەن ..!!

# جیاوازی نیوان نیەت و ئەخلاص

بەلی بی گومان هەندیك لە خەلکی ووشەی نیەت لە بری ئەخلاص بە کار دەهینن ، بەلام لە راستی دا جیاوازی زۆری هەیە لە خوارەوە دا کەمیك باسی نیەت دەەن ئینجا جیاوازی نیوان نیەت و ئەخلاص روون دە بیت چونکە بە مانا کوردەیە کەی نیەت واتا نیازی پاکی بەلام ئەخلاص واتا دل سۆزی بی گوما جیاوازی زۆری هەیە لەرووی دەربرین و کارو کردەوەدا.

**النیەت یان نیازپاکی :** لە بنچینە دا لە لای فقهای شرع زانان : جیاکردنەوە پەرستن یان عیبادەتی لە عادات نەریت دا ، وە جیاکردنەوەی پەرستن یان عبادات لە هەندیك لە هەندیکی تر دا .[10]

هەروەك : جیاکردنەوە عیبادات لە عادات و نەریت، وە ك جیا کردنەوە شووشتن و خاوین کردنەوەی دەست نویژ یان خاوین کردنەوەی دست و دەم و چاوە ، وە جیا کردنەوە لە شووشتنی گەورە یان جنابەت واتە : جیاکردنەوە غوسل کردنی بچووك لە غوسل کردنی گەورە .



شووشتنی بچووک – شووشتنی گەورە

---

[10]– جامع العلوم والحكم (١/١١) .

یان وەك جیا كردنەوە عیبادات لە هەندیك لە هەندیكی تر ، وەك جیاكردنەوە نویژی نیوەڕۆ لە نویژی عەصر دا .



جیاكردنەوەی نویژە كان بی گومان دبیت نیەتی نویژ نیوەڕۆت هەبیت جیابكەیتەوە لە گە نویژی عەصر و مەغرب و عیشا و بە یانی ، هەر هەموو عیباتە كان دەبیت بە نیەت بیت نیەت و نیازت لەسەر بیت یان هەر كردەوەیەكی مرۆڤ كە ئەنجامی دە دات دەبیت نیەت و نیازی تەواوت لەسەری بیت ئینجا ئەنجامی دەدیت گەر ئەنجامان دا دەبیت ئەخلاص و دل سۆزی لەسەر بیت بی گومان بەم جیاوازیانە بۆمان دەر كەوت جیاوازی نیوان نیەت و ئەخلاص .

بەلام نیەت یان مەبەست بابە تی سەرەكی ئیمە نیە بەلكو بابەتی سەركی ئیمە ئیخلاصە یان دل سۆزی یە ، واتە نیەت مەبەستی لی جیاكردنەوەی كردەویە ، وە ئایا ئەو الله یە تەنهایە هیچ هاوەل شەریكی نیە ، یان خوایە كی تر بوونی هەیە ؟! والعیاذ بالله. ئەوە ئەو نیە تەیە یان ئەو مەبەستەی دەچیە ناوەوەی ئیخلاص .

بەلی ئیخلاص عیبادە ت صدق واتە : دل سۆزی و پەرستن و راست گۆیی هەر سی كیان ماناكانیان نزیكە لە یەكەوە ،بەلام هەندیك جیاوازی لە نیوانیان دا هەیە :

راست و راست گۆیی لە بنچینە دا یەكەمە لەپیش ئیخلاصەوە ، ئیخلاص لقیكە پابەندە بە راست گۆیە وە ..

ئیخلاص نابیت تەنها دوای چوونە ناوەوەی كارە كە ، بەلام راست گۆیی دەبیت پیش چوونە ناوەوەی كارە كە بیت

## فەرمان کردن بە ئەخلاص لە قورئانی پیرۆزدا

**( خوای گەورە ) فەرمانده کە بە بەندە کانی بە ئەخلاص یان دڵ سۆزی ، لە چەندین شویندا لە قررئانی پیرۆزدا .**

**(خوای گەورە ) دەفەرموويت :** ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ ] البينة ٥ .

واتا: (لەگەڵ ئەوەشدا) کە فەرمانیان پێ نەدرا بوو مەگەر بەوەی کە پەرستشی خوا بکەن بەدڵسۆزی ملکەچی بۆ بکەن وخۆیان بە دوور بگرن لە هەموو بیرو باوەڕێکی خوارو خێچ، ..

**(خوای گەورە ) فەرمان بە پیغه مبەر صلى الله عليه وسلم دە كات بە ئەخلاص و دڵ سۆزی لە پەرستنە کانی دا .**

**(خوای گەورە ) دەفرموويت**﴿ قُلِ ٱللَّهَ أَعۡبُدُ مُخۡلِصٗا لَّهُۥ دِينِي ﴾ **الزمر ١٤** بڵێ من هەر خوا دەپەرستم بە پاکی و تەنها هەر بۆ ئەو ملکەچم» [الزمر: ١٤].

**هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموويت :**﴿ قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ

لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرۡتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ] الانعام ١٦٢– ١٦٣ .

**واتا:** ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: نوێژ کردن و حەیوان سەربڕین و ژیان و مردنم بۆ الله یە کە پەروەردگاری هەموو جیهانە، چۆن نوێژ کردن بۆ غەیری خوا شەریك دانانە، حەیوان سەربڕینیش بۆ غەیری خواو ناوی غەیری خوای لەسەر بێنی ئەویش هەر شەریك دانانە بۆیە خوای گەورە بەیەکەوە هێناویەتیەوە، وە تەنها بۆ خوا ئەژیم وە لە پێناو خوای گەورەشدا ئەمرم ..!!!

لَا شَرِيكَ لَهُ ] لەم شتانە خوای گەورە شەریکی نیە چۆن لە نوێژدا شەریکی نیە هەر ئەبێ بۆ ئەو بیکەی لەسەربڕینیشدا شەریکی نیەو دەبێت ئاژەڵ هەر بۆ ئەو سەربرِی [ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ ] وە بەم شتانە من فەرمانم پێکراوە لەلایەن خوای گەورەوە [ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ وە من یەکەم موسڵمانم لە ئوممەتەکەی خۆم..!!

**(خواي گەورە ) وسفی ئەوە دە كات كە دروست كردن مردن و ژيانی بەديهيناوە تەنها بۆ ئەوە نەبيت كە خەلك كامە يان  باشترين كار ئەنجام بدات .**

**هەروەك دە فەرموويت :** ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًاۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ﴾ **الملك ٢**

واتا: ئەو خوایەی کە مردن و ژیانی دروست کردووە تا تاقیتان بکاتەوەو دەرکەوێت کامتان باشترین کردەوەتان ئەنجام داوە، باشترین کردەوەش ئەوەیە مرۆڤ نیەتی بۆ خوای گەورە بێت و بۆ ریای نەبێت، وە لەسەر سوننەتی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - بێت و بیدعە نەبێت، بۆیە هیچ کاتێك بە بیدعە ناووترێ: کردەوەی چاك، وە خوای گەورە لێرە نەیفەرموو کامتان کردەوەی زۆرترە بەڵکو فەرمووی: کامتان کردەوەی چاکترە [ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ ] وە خوای گەورە زۆر بەعیززەت و باڵادەست و لێخۆشبووە..!!

لە (الفضيل كوری عياض ) – **رحمە تی خوای لی بيت – دە ليت : وازهينان لە كار لە پيناوی خەلكد ئەوا (ريايە ) كار كردنيش لەپيناوی خەلكيدا هاوەلدانانە ، ئە خلاص ئەوەيە خودا  لە و دووانە بتپاريزيت .**

**ووتراوە : ئەخلاص ئەوە يە لە سەر كارو كردەوە كانت هيچ شايەتيك دوا نەكەيت جگە لە (خوای گەورە ) وە دوای چاداشت نەكە لە كەس جگە لە (خوای گەورە ) ..!!**

**لە (جنيد ) – رەحمەتی خوای لی بيت – دەليت : ئە خلاص نهينيە كە لە نيوان خوا بەندە دا ، فريشتە كانيش پی نازانيت بينووسيت ، وە شەيتانەكانيش پی نازانن لی تيكبدات ، و ئارە زوو پيی نازانيت  خواری و خيچی بكات .**

**لە(مكحول ) –رە حمەتی خوای لی بيت – دەليت : هەر بەندەيەك چل رۆژ ئەخلاصی هەبيت بۆ خوا  ، ئەوا  كانياوی  حيكمەت لە دڵ و لەسەر زمانی هەلدە قوليت ..!!**

**لە (ابو سليمان دارانی ) – رەحمەتی خوای لی بيت – دەليت : كاتيك بەندە يەك دەگاتە ئەخلاص وەسوەسە و ريا لی جيا دە بيتەوە ..!!**

**ووتراوه : ئەخلاص : بریتیە لە پالفتە کردنی کارو کردەوەکان لە خەوشو خاڵ .!!**



**هەروەها دووبارە لە (الفضیل کوری عیاض )– رحمە تی خوای لی بیت – دە لیت :( أحسن عمل ) بریتیە لە : ((اخلصه وأصوبه ) ووتیان : باوکی علی (اخلصه وأصوبه ) چیە ..؟! ووتی : کار گەر (خالص ) بیت وە (صواب ) نە بیت وەرناگریت ، هە تاکو کارەکە خالص و صواب بیت ئەو جا وەردەگیریت ،( خالص ) ئەوە یە بۆ خوا ئەنجام بدریت ، (صواب ) سوونەتی پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەنجام بدریت وە ئەم ئایەتەی خویندەوە ..!!**

**(خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ﴾ **الكهف ١١٠ .**

واتا: ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: من تەنها وەك ئێوە مرۆڤێكم فریشتە نیم یان خوا نیم [ يُوحَى إِلَيَّ ] جیاوازیەكەم ئەوەیە كە لەلایەن خوای گەورەوە وەحیم بۆ دێت و كراوم بە پێغەمبەر [ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ ] وە پەیامی منیش ئەوەیە كە پەرستراو و خوای ئێوە تەنها یەك خوایەكەو شەریكی نیەو تاك و تەنهایە [ فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ ] جا هەر كەسێك بە ئومێدی گەیشتنە بە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت بە سەری بەرزو بە ڕووی سپی كە باوەڕدارانن [ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا ] با لە دونیادا كردەوەی چاك بكەن، (واتە: لەسەر سوننەتی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - بێت و بیدعە نەبێت) [ وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا (١١٠) ] وە لە كاتی عیبادەت كردن بۆ پەروەردگاری هیچ كەسێك نەكاتە شەریك بۆ خوای گەورە، (واتە: بۆ ڕیای نەبێت و بە ئیخلاص و دڵسۆزیەوە كردەوەكانی بۆ خوای گەورە ئەنجام بدات) ئەم ئایەتە هەردوو مەرجەكەی وەرگرتنی كردەوەی كۆكردۆتەوە، والله أعلم !!..

**(خوای گەورە ) وسفی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دە کات کە ئاینی خوایە کە چاك ترین ئاینە .**

**(خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿ وَمَنۡ أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا ﴾ **النساء ١٢٥ .** واتا :ئایا كێ ئایینی چاكترو جوانترە (وە كێ دیندارترە) لە كەسێک كە ڕووی خۆی یەكلا كردبێتەوە بۆ خوا لە هەمان كاتدا ئەو كەسە چاكەكار بێت و شوێنی ئاینی ئیبراهیم كەوتبێت بەڕاستی و پاكی (كە بە ویستی خۆی لە بەتاڵ لای داوە بۆ لای ڕاست) وە خوا ئیبراهیمی هەڵبژارد بەدۆست و خۆشەویستی خۆی .

**(خوای گەورە ) ووصیەت بە پیغەمبەرە کەی صلى الله عليه وسلم و ئۆمەتەکەی دە کات کە لە گە ل ئەهلی ئەخلاص بن .**

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : [ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ] الكهف ٢٨ .

واتا : خۆت ڕاگرە لەگەڵ ئەوانەی لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە و یادی ئەو دەکەن (و دەیپەرستن) بەیانیان و ئێواران کە مەبەستیان ڕەزامەندی خوایە چاوەکانت لەوان لامەدە و وەرمەگێڕە (بۆ کەسانی بێ باوەڕی دەوڵەمەند) کە جوانی و ڕازاوەیی ژیانی ئەم دونیای دەوێت و بەگوێی کەسێک مەکە کە دڵیان لە یادی خۆمان بێ ئاگا کردوە و شوێنی هەوا و ئارەزووی خۆی کەوتووە هەموو کارەکانی خراپ و لە سنوور دەرچووە ..!!

**(خوای گەورە ) وسفی ئەوانەدەیانەویت لە پیناوی خوادا بن ئەوا سەرکەوتوو سەر فرازن .**

(خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ الروم ٣٨

واتا: پێدانی ماف بە خاوەن مافەکان [ فَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ ] ئەو کەسەی کە خزمی نزیکتە حەقی پێ بدە و چاکەکاربە لەگەڵیداو پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنە [ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ ] وە یارمەتی فەقیرو هەژارو ڕێبوار بدە [ ذَلِكَ خَيْرٌ لِلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ ] ئەم کردەوانە باشترە بۆ کەسانێك کە مەبەستیان بینینی ڕووی پیرۆزی خوای گەورەو ڕەزامەندی و پاداشتی بێت لە ڕۆژی قیامەتدا (جێگیر کردنی ڕووی پیرۆزی خوای گەورەی تێدایە کە ڕوویەکی پیرۆزو بەرێزەو لە ڕووی هیچ لە دروستکراوەکانی ناچێت و چۆنێتییەکەیشی خوا نەبێت کەس نایزانێت تا لە ڕۆژی قیامەت و لە بەهەشتدا إن شاء الله دەیبینین) [ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٣٨) ] وە ئەو کەسانە سەرفرازو سەرکەوتوون لە دونیاو قیامەت.

**(خوای گەورە ) پەیمان دەداتە ئەوانەی کە ئەخلاص یان هەیە لە ئاگری دۆزەخ رزگاریان دەبیت**

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ٱلَّذِي يُؤْتِي مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴾ الليل ١٧_٢١ .

واتا: [ وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى (١٧) ] وە بەتەقواترین کەس لەو ئاگرە گڕو بڵێسەدارە خۆی دوور ئەخاتەوە، کە زۆربەی موفەسیرین ئەفەرموون مەبەست پێی (ئەبوبەکری صدیق)ە (خوای لێ ڕازی بێ)، بەڵکو هەندێکیان کۆدەنگی زانایانی موفەسیر نەقڵ ئەکەن لەسەر ئەوەی کە ئەم ئایەتانە لەسەر (ئەبوبەکری صدیق) دابەزیوە (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ) کە لە هەموو کەس بەتەقواتر بووە لە پاش پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ( إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ) (الْحُجُرَات: ١٣) وە بەڕێزترینیش لای خوای گەورە ئەو کەسەیە کە بەتەقواترین بێ, کەواتە بەڕێزترین کەس لای خوای گەورە لە پاش پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەبوبەکر بووە، بەڵکو لە پاش هەموو پێغەمبەران باشترین و بەتەقواترین و چاکترین و بەڕێزترین و پاکترین و شیاوترین کەس (ئەبوبەکری صدیق) ..!! الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّى ) (١٨) ] کە لە پێناو خوای گەورەدا ماڵی خۆی ئەبەخشێ و مەبەستی ئەوەیە کە خۆی پاك بکاتەوە لە تاوان بەڵکو لای خوای گەورە پاك بێ وە مەبەستی ڕیاو ناوبانگ و شوهرەت و پاداشتی خەڵکی نییە .. (وَمَا لِأَحَدٍ عِنْدَهُ مِنْ نِعْمَةٍ تُجْزَى ) (١٩) ] وە کاتێك کە ئەم ماڵە ئەبەخشێ مەبەستی ئەوە نییە لە بەرامبەر پاداشتی کەسێك بیکات، یان چاوەڕێی پاداشتی کەسێك بێ، یان چاوەڕێی نیعمەتی کەسێك بێت ..!!

[ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَى )(٢٠) ] بەڵکو تەنها مەبەستی ڕووی پیرۆزی پەروەردگاری بەرزو بڵندێتی، وە چاوەڕێی ئەجرو پاداشتی خوای گەورەیە و بە ئومێدە لە ڕۆژی قیامەتدا لە بەهەشتدا ڕووی پیرۆزی خوای گەورە ببینێ، وە مەبەستی ئەوەیە کە خوای گەورە لێی ڕازی بێت و ڕەزامەندی خوای گەورە

بەدەست بێنێت ..!! (وَلَسَوْفَ يَرْضَى ) (٢١) ] وە بەدڵنیایی خوای گەورە لە بەهەشتدا ئەوەندە ئەجرو پاداشتی ئەداتەوەو ئەوەندە ڕێزی لێ ئەگرێ و ئەوەندە نازو نیعمەتی پێ ئەبەخشێ تا ڕازی ئەکات, وتمان: ئەمانە لەسەر (ئەبوبەکری صدیق) (خوای لێ ڕازی بێ) هاتۆتە خوارەوە بەڵام گشتیشەو بۆ هەمووکەسێکە کە ئەم سیفەتانەی تیادا بێ خوای گەورە ئەو ئەجرو پاداشتانەی ئەداتەوە، والله أعلم . بەم شێوازە هاتینە کۆتایی تەفسیری سوورەتی (لەیل) والحمد لله..!!

**(خوای گەورە ) یاد و وسفی ئەو کەسانە دە کاتەوە کە لە ژیانی دنیادا ئەخلاص یان هەبووە .**

**(خوای گەورە ) دەفەرموویت :** [ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ] الانسان ٩

واتا : (إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ ) ئێمە تەنها لەبەر ڕووی پیرۆزی خواو لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە خواردنتان پێ ئەدەین، بە دەم وایان نەووتووە بەڵام خوای گەورە ئاگای لە دڵیانەو قسەی دڵیانەو خوای گەورە دەری کردووە ( لَا نُرِيدُ مِنْكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا ) (٩) ] ئێمە پاداشتمان لە ئێوە ناوێت و چاوەڕێی ئەوە نین کە لەلای خەڵکی سوپاسمان بکەن یان باسمان بکەن بەڵکو تەنها لەبەر خوای گەورە بووە..!!

**(خوای گەورە ) پەیمان دە دات بە و کە سانەی کە پاداشتیکی گەورە یان پی دە بەخشیت لە دوا رۆژ دا**

**بە هۆی ئەوەی کە ئەخلاص یان هە بوو یان دڵ سۆزیان هە بووە بۆ خوای گەورە لە دنیا دا**

**(خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَٰحٍ بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ الانساء ١١٤ . واتا: [ لَا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِنْ نَجْوَاهُمْ ] خێر لە زۆرێك لە چپە چپ و نهێنی قسەكردنی خەڵكیدا نیە لەبەر ئەوەی زۆربەی لە تاواندایە [ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ ] تەنها مەگەر كەسانێ كە فەرمان بكەن بە صەدەقەو بەخێر كردن بۆ ئەوەی نەبێ بە ڕیا [ أَوْ مَعْرُوفٍ ] یان فەرمان بكەن بەچاكە [ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ] یاخود چاكسازی و صوڵح بكەن لە نێوان خەڵكی [ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ] (١١٤) ] وە هەر كەسێك ئەم شتانە بكات و نیەت و مەبەستی ڕەزامەندی خوای گەورە بێت ئەوە ئێمە ئەجرو پاداشتێكی زۆر گەورەی ئەدەینەوە..!!

**وە (خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِي حَرْثِهِۦ ۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾ الاشوری ٢٠ . واتا[ مَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ ] هەر كەسێك بە كردەوەكانی مەبەستی پاداشتی ڕۆژی قیامەتە ئەوە ئێمە پاداشتەكەی بۆ زیاد ئەكەین و چەند قاتێكی ئەكەین: یەك بە دە تا یەك بە حەوت سەد تا زیاتر [ وَمَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا ] وە ئەوەیشی بە كردەوەكانی مەبەستی پاداشتی دونیایە ئەوە لە دونیادا پێی ئەبەخشین [ وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ نَصِيبٍ (٢٠) ] بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ بەش و پاداشتێكی لە خێرو چاكە نابێت لەبەر ئەوەی بۆ دونیا هەوڵی داوە ..!!

# ئەخلاص لە فەرموودە کانی پیغەمبەری خوا ﷺ

بی گومان پیغەمبەری خوا ﷺ زۆر جوان لە فەرموودەکانی بۆمانی روون کردۆتەوە کە ئەخلاص یان دڵ سۆزی چەند گرینگە لە چوار چیوەی کارو کردەوە کانمان دا ، چونکە ئەخلاص دڵسۆزیە و راست و نیەت پاکیە بۆ خوای گەورە .

لە (عمری کوری خە تاب ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموو یەتی :

(( إنما الأعمال بالنيان ، وإنما لكل امرى ما نوى )) .[١١]

واتا: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : کارو کردەوە کان هە ر بە پیی نیان نیاز پاکیە ، هەر کەس و بە پیی نیەت و نیازی خۆی یەتی کارو کردەوە کان .

بەلی ئەم فەرموودەیەی پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە هەر فەرموودە گرینگە کان ، چونکە بناغە و بنچینەی شەرعیە بۆ هەموو پەرستنەکان ، وە هیچ جیگەروە ویە کی نیە ، چونکە بناغەی پەرستنە وە ك : نویژ و رۆژوو جیهاد و حەجی مالی خوا صدقە و خیر دا ، بەلی ئەمانەی کە باسمان کرد هەر هەموو بەستەراوە تەوە وە پیویستی بە ئەخلاص و دڵسۆزی نیەت نیاز پاکی چاك و ئەخلاص لە کارو کردەوە دا ..!!

هەروەها ئەم فەرموودەیەی پیغەمبەری خوا ﷺ تەنها بەس نیە بۆ ئەوانەی کە باسمان کرد لە سەرەوە دا کە وەك نویژ و رۆژو جیهاد و حەجی مالی خوا ، بە لکو بۆ کردەوە کانی تریش دە بیتە بناغە و قاعدەی شەرعی لە چوار چیوەی کردەوە کاندا وە ئەمانەی خوارەوە کە تیدا باسیان دە کەین وەکو یەك تا پەرستی یان التوحيد ، رۆژوو ، چوونە مەزگەوت یان درەچوون لە مەزگەوت دا نویژ بە کۆمەل ، یان شەو نویژ کردن ، یان خیر و صدەقە یادی خوا زۆر کردن یان جیهاد و تی کۆشان ، یان شوین کەوتنی جنازە ، کە ئەمانەی خوارەوەن باسیان دە کەین بە پشتیوانی خوا ی گەورە .!!

---

[١١]ـ صحيح مسلم (١٩٠٧ ).

## یەکەم : یەك خوا پەرستی بە تەنها (التوحيد) – (لا اله إلا الله ) :



له (ابو هريره ) – خوا لی رازی بيت – دەليت : له پيغەمبەری خوا ﷺ فەرمويەتی :

(( ما قال عبدٌ لا إلهَ إلَّا اللهُ قطُّ مخْلِصًا إلَّا فُتِحَتْ له أبوابُ السماءِ حتى تُفْضِيَ إلى العرشِ ما اجتَنَبَ الكبائر )) .[١٢]

واتا: لـه پيغەمبەری ﷺ فەرموويەتی : هەر كەس بە پاكی و بە ئەخلاصيەوە بلی: (لا إلـه إلا الله ) بە مەرجی ئيـلـلا درەگاكانی بە هەشتی بۆ دە كريتەوە هەتا دەگاتە عەرشی پەروەردگار ، بە مەرجی خۆی بەدوور بگريت لـە تاوانە گەورە كان ..!!

## دووەم : چوونە ناو مەزگەوت يان دەرچوون لـە مەزگەوت دا:



لە (ابو هريره ) – خوالی رازی بيت – لە پيغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی :

(( مَن غَدَا إلى المَسْجِدِ ورَاحَ، أعَدَّ اللَّهُ له نُزُلَهُ مِنَ الجَنَّةِ كُلَّما غَدَا أوْ رَاحَ)) .[١٣]

واتە : لـە پيغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی : هەر جاريك كەسيك دە چيت بۆ مەزگەوت ، يان لـە مەزگەوت دە گەريتەوە (خوای گەورە ) لـە بە هەشتدا سەفرەيەك يان نانيك كە شايەنی ميوان داری بی بۆ ريك دە خات يان ئامادە دەكات .

[١٢]_ سنن الترمذي برقم (٣٥٩٠ ) .

[١٣]_ صحيح البخاري برقم (٦٦٢) .

## نویژ کردنی به کۆمەل له مەزگەوتدا :



له (ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت :له پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی :

(( صلاةُ الرَّجلِ في جماعةٍ تزيدُ علَى صلاتِه في بيتِه وصلاتِه في سوقِه خمسًا وعشرينَ درجةً وذلِك بأنَّ أحدَكم إذا توضَّأَ فأحسنَ الوضوءَ وأتى المسجدَ لا يُريدُ إلَّا الصَّلاةَ ولا ينهزُه إلَّا الصَّلاةُ لم يخطُ خطوةً إلَّا رُفعَ لَه بِها درجةٌ وحطَّ عنهُ بِها خطيئةٌ حتَّى يدخلَ المسجدَ فإذا دخلَ المسجدَ كانَ في صلاةٍ ما كانتِ الصَّلاةُ هيَ تحبسُه والملائِكةُ يصلُّونَ علَى أحدِكم ما دامَ في مجلسِهِ الَّذي صلى الله عليه وسلم فيهِ ويقولونَ اللَّهمَّ اغفر لَه اللَّهمَّ ارحمهُ اللَّهمَّ تب عليهِ ما لم يؤذِ فيهِ أو يُحدث فيهِ )) . [١٤]

واتا: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی : هەرکەسیك نویژی به کۆمەل بکات لە مەزگەوتدا ، بیست و پینچ پلە یان درجە خیرو پاداشتی پی دەگات ، لەو نویژەی کە لە مالەوە یان لە بازاردا ئەنجامی دەدات ، واتە : (خیرو پاداشتی نویژی بە کۆمەل لە مەزگەوتدا زیاترە لەمالە وە دا یان لە بازاردا کە بە تەنها ئەنجامی دە دات ) ، ئەویش لە بەر ئەمەیە کە چونکە هەر کاتی کەسیکتان دەست نویژ جوان بگری وە درەچی بەروە مەزگەوت ،لە چوونی بۆ مەزگەوت تەنها مەبەست و ئەخلاصی نویژ بیت ، وە تەنها نیازی ئەوەبیت کە بۆ نویژی بە کۆمەل دەچیت ئەخلاصی لە گەل دابی ، هەر هەنگاویك دەنیت پلە یەك یان دەرەجەیەك بەرز دەبیتەوە ، گۆناهیکی بۆ ئەسریتەوە هەتاکو دەچیتە مەزگەوتەوە ،کاتی کە چووەناو مەزگەوتدا ئەوە ئیتر لە نویژدایە مادەم نویژ ریگری لی کردبیت لە مەزگەوت بیتە دەرەوە ،وە فریشتەکان دوای لی خۆش بوونی بۆ دەکەن هەتا لە جیگەی نویژەکەیدا بمینیتەوە وو چاوەریی نویژ بکات دەلین ك خودایە لی خۆشبە ، خودایە رەحمی پی بکە ، خودایە توبە و پەشیمانی لی وەر بگرە ، تاکو دەستویژی هەبی و ئازاری کە س نەدات بەدەست و بە زمانی ..!!

---

[١٤]_ صحيح ابو داود برقم (٥٥٩).

## دووەم : ڕۆژوو گرتن  لە مانگی ڕەمەزان یان جگە لە ڕەمەزان :



لە (عبدالرحمن کوری عوف ) – خوا لی ڕازی بیت –لە پیغەمبەری خوا ﷺ:

((إنَّ اللَّهَ تبارکَ وتعالی فرضَ صیامَ رمضانَ علیکم وسننتُ لکم قیامَهُ فمن صامَهُ وقامَهُ إیمانًا واحتسابًا خرجَ من ذنوبِهِ کیومِ ولدتْهُ أمُّه )) .[15]

واتا:  لە (عبد الرحمن کوری عوف ) دەلیت : لە پیغەری خوا ﷺباسی مانگی ڕەمەزانی کرد فەزل و گەورەیی دا بەسەر هەموو مانگە کان دا ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : کە هەرکەسیك هەلسیت بۆ شەو نویژ براوی پی هەبیت چاوە ڕوانی پاداشت بیت ، لە لای خوای گەورە ،لە گوناهە کانی دەردەجی وەکو ئەو ڕۆژەی کە لە دایك بووە ..!!

لە (ابو سعید الخدری ) – خوا لی ڕازی بیت – دەلیت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ:




(( مَن صامَ يَوْمًا في سَبيلِ اللَّهِ، بَعَّدَ اللَّهُ وجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا )) .[16]

واتا: پیغەمبەری خوا  فەرمووی :  هە رکەسیك  یەك ڕۆژ بە ڕۆژوو بیت لە پیناوی خو دا  ، ئەوا (خوای گەورە ) حەفتا پایز ڕۆخساری لە ئاگری دۆزەخ دوور دە خات ..!!

لە (ابو هریرە ) – خوا لی ڕازی بیت – دەلیت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ :




((   مَن قَامَ رَمَضَانَ إيمَانًا واحْتِسَابًا، غُفِرَ له ما تَقَدَّمَ مِن ذَنْبِهِ )) .[17]

واتا: پیغەمبەری خوا ﷺفەرمووی : هەر کەسیك مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بیت بە ئیمان و باوەڕە وە بۆ بەدەست هینانی پاداشت لە لایەن خوای گەورە وە ، ئەوا خوای گەورە لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دە بیت ..!!

---

[15]_ سنن النسائي برقم (٢٢٠٩).

[16]_ صحیح البخاري برقم (٢٦٨٥) ومسلم (١١٥٣) .

[17]_ صحیح البخاري برقم (٣٧) و مسلم (٧٥٩ ).



## سی یەم : صدقەو خیرو نزاو زکر و یادی (خوای گەورە ) :

له (ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت –له پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :

((سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ في ظِلِّهِ، يَومَ لا ظِلَّ إلَّا ظِلُّهُ: الإمَامُ العَادِلُ، وشَابٌّ نَشَأَ في عِبَادَةِ رَبِّهِ، ورَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ في المَسَاجِدِ، ورَجُلَانِ تَحَابَّا في اللَّهِ اجْتَمعا عليه وتَفَرَّقَا عليه، ورَجُلٌ طَلَبَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وجَمَالٍ، فَقَالَ: إنِّي أخَافُ اللَّهَ، ورَجُلٌ تَصَدَّقَ، أخْفَى حتَّى لا تَعْلَمَ شِمَالُهُ ما تُنْفِقُ يَمِينُهُ، ورَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ )) .[١٨]

واتا: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : حەوت جۆر کەس هە کە (خوای گەورە ) دە یان خاتە ژیر سیبەری خۆی ئەویش لەم رۆژە دا واتە : (رۆژی دوایی یان رۆژی قیامەت یان رۆژی حەشر ) کە هیچ سیبەریك و سایە ك نیە جگە لە سایە و سیبەری خوای گەورە ، ئەوانیش ئەمانەن : پشە وایەکی داد پەروەر ، گەنجیگی لە خوا ترس کە گەنجایەتی خۆی لە سەرەتای تەمەنیدا لە سەر خوا پەرستی عیادەت گەورە بوو بیت ، کەسیك دلی پیویست بیت بە مەزگەوتەوە ، دوو کەس لە بەر خاتری خوا یان لە پیناوی خوا دا یەکتریان خۆش بوویت لە سەر ئەم بناغەیە بە یەك گەیشتبن وە دوور کەوتنەوە جیا بوونەوەشیان لە پیناوی خوا دا بیت ، کە سیك کە ئافرەتیکی جوان ناودار بانگی بکات بۆ بەد رەوەشتی ئەو کەسە لەبە خاتری خوا یان لە ترسی خوا رازی نەبیت قبولی نەکات ، کەسیك خیر و صەدقە دەکات و دەیشاریتەوە بەنهینی هەتاکو دەستی راستی نازانیت دەستی چەپی صەدقەو خیرو بەخشیوە ، کەسیك بە تەنهایی یادی خوا بکات ..!!

له (ابی مسعود عقبه بن عمر ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : له پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

((إِذَا أَنْفَقَ المُسْلِمُ نَفَقَةً علَى أَهْلِهِ، وهو يَحْتَسِبُهَا، كَانَتْ له صَدَقَةً )) .[١٩]

واتا: پیغەمبەری خوا فەرموویەتی : هەر کەسیك خەرجیەك خەرج بکات بۆ خیزان نەکەی یان بۆ کەس وکارەکەی ، ئەوا بە مەبەستی بەدەست هینانی ئەجرو پاداشت بیت لە لایەن (خوای گەورە ) وە ، ئەوا ئەجرو پاداشتی لەسەر خرج کردن یان نفقەی خیزانی وەر دە گریت ..!!







---

[١٨]_ صحيح البخاري برقم (١٣٥٧) و مسلم (١٠٣١).

[١٩]صحيح البخاري برقم (٥٣٥١).

## زکرو یادی (خوای گەورە ) وە لە فەرموودە کانی پیغەمبەری خوا ﷺ هاتوون
## کە ژمارەیان زۆرە لیرە تەنها چەند نموونەیەك دە هینینەوە :



لە (أبو هريره )– خوا لی رازی بیت – دەلیت :

**((كانَ رَسولُ اللهِ ﷺيَسِيرُ في طَرِيقِ مَكَّةَ، فَمَرَّ علَى جَبَلٍ يُقالُ له:**
**جُمْدانُ، فَقالَ: سِيرُوا، هذا جُمْدانُ، سَبَقَ المُفَرِّدُونَ، قالوا: وَما المُفَرِّدُونَ يا رَسولَ اللهِ؟**
**قالَ: الذّاكِرُونَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذّاكِراتُ )) .** [٢٠]

واتا: پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەرۆیشت لە ریگای مككە دا ، بە لای شاخیدا تی پەری ،فەرمووی : (جمدان) واتە : بی جوولەن ،یان رۆیشت فەرمووی : ئەوە (جمدان ) واتە : ئەم دوو شاخە بی جوولەن ، یان فەرمووی : تاك بووە كان ، دەلیت ووتم : تاك بووە كان چیە ئە ی پیغەمبەری خوا ﷺ ؟! فەرمووی : چونكە بەهۆی زۆر یاد كردنی خوا لە خەلكی جوی بوونەوە و تاك بوونەوە ..!!



لە (عبدالله بن عمر ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت :

لە پیغەمبەری خوا ﷺفەرمووی :

**((اللهمَّ إنِّي أسألُكَ العَافِيَةَ في الدنيا و الآخرةِ اللهمَّ إنِّي أسألُكَ العَفْوَ و العَافِيَةَ في دِينِي و دُنْيايَ ، و أهلِي و مالِي اللهمَّ اسْتُرْ عَوْرَتِي ، و آمِنْ رَوْعَاتِي اللهمَّ احْفَظْنِي من بَيْنِ يَدَيَّ و من خلفِي ، و عن يَمِينِي و عن شِمالِي ، و من فَوْقِي ، و أعوذُ بِعَظَمَتِكَ أنْ أُغْتَالَ من تَحْتِيظ)) .** [٢١]

---

٢٠_ صحيح مسلم برقم (٢٦٧٦).

٢١_ شيخ الالباني صحيح الادب المفرد (٩١٢ )



له (ابو هريره ) – خوا لی رازی بيت – دهڵيت:

(( من قال سبحانَ اللهِ وبحمدهِ مائةَ مرةٍ غُفِرَتْ له ذنوبهُ وإن كانت مثلَ زبدِ البحرِ)) .[22] .

واتا: (سبحان الله ) و(الحمدالله ) سهد جار بخوينه له رۆژيكدا (خوای گهوره ) ليت خۆش دهبيت له گوناهه كان ئهگهر به قد كهفى دهريا گوناهت ههبيت ..!!



له (ابو مسعود عقبه بن عمرو ) – خوا لی رازی بيت – دهڵيت :

له پيغهمبهری خوا ﷺ فهرموويهتی :

(( أنَّهُ مَن قَرَأَ بالآيَتَيْنِ مِن آخِرِ سُورَةِ البَقَرَةِ في لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ )) .[23]

واتا: ههر كهسيك دوو ئايهت له كۆتايی سورهتی بقره دا بخوينی ، ئهوا بهسيهتی (له قيام الليل ) يان شهو نويژی يان ووراوه بهسيه تی بۆ پاريزران له شهو و زيانی ئهم شهو ..!!

---

[22] _ سنن الترمذي برقم (٣٤٦٥).

[23]_ صحيح البخاري برقم (٥٠٥١).

## چوارەم : جیهاد و تی کۆشان له پیناوی خوا دا :



له (عباده ی کوری الصامت ) خوا لی رازی بیت – دەلیت :

پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :

(( من غزا في سيبل الله ولم ينو إلا عقالا فله ما نوى )).[٢٤]

واتا: پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : هەر كه سيك له پیناوی خوادا بجەنگی وه نیەتی یان نیازی ئەوەی بی گوریسیکی دەست بکەوی ئەوه به پیی نیەتەکەی خۆیەتی ..!!



له (ابی نجیح السلمی ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت :

گویم له پیغەمبەری خوا ﷺ بوو دەی فەرموو :

(( من بلغ بسهم فى سبيل الله ، درجة في الجنة فبلغت يومئذ ستة عشر ، قال سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول : من رمي بسهم في سبيل الله فهو عدل محرر )).[٢٥]

واتا: (ابو نجیح السلمي ) – خوا لي رازي بيت – دەلیت : گویم له پیغەمبەری خوا ﷺ بوو دەی فەرموو:

هەر کەسیك تیریك بهاویژی له پیناوی خوا دا ، ئەوا پله یەکی بۆ هەیه له بەهەشتدا ، جا ئەو رۆژه شانزه تیرم هاویشت ، دەلی : گویم له پیغەمبەری خوا ﷺ دەی فەرموو: هەر کەسیك تیریك بهاویژی له پیناوی خوا ئەوه وەکو ئەوه وایه بەندەیەك ئازاد بکات یان بەندەیەك رزگار بکات ..!!

---

[٢٤]_ النسائي برقم (٣١٣٨).

[٢٥]النسائي برقم (٣١٤٣).



## پینچەم : نویژ کردن و شوینکەوتنی مردوو :

لە (برائی کوری عازب ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت :

پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :

(( من تبع جنازة حتى ﷺ عليها كان له من الأجر قيراط ، ومن مشي مع الجنازة حتى تدفن كان له من الأجر قيراطان ، والقيراط مثل أحد )) .[٢٦]

واتا: پیغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : هەر کەسیك شوینی جنازە یەك بکەویت تا نویژی لەسەر دەکریت ئەوە پاداشتی قیراتیکی بۆ هەیە ، وە هەر کەسیك لە گەل جنازەیەك دا ری بکات یان شوینی کەویت تاکو دەخریتە قبرەوە ئەوا پاداشتی دوو قیراتی بۆ هەیە ، قیراتیش بە ئەندازەی چیایی یان کیوی ئوحدا ..!!




لە (ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت :

لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە تی :

(( من تبع جنازة ﷺ عليها فله قيراط ، ومن تبعها حتى يفرغ منها فله قيراطان ، أصغرهما مثل أحد أو أحد هما مثل أحد)).[٢٧]

واتا : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : هەر کەسیك شوینی جنازەیەك بکەویت و نویژی لەسەر بکات ئەوا (قیراتیك ) پاداشتی بۆ هە یە ، (قیراط ) بچووکە کەیان بە قەد چیایی یان کیوی ئوحد دەبیت ، وە یان قیراتیکیان بەقەد کیوی ئوحود دەبیت ..!!

---

[٢٦] ـ سنن النسائي برقم (١٩٤٠ ).
[٢٧] ـ سنن ابو داود برقم (٣١٦٨).

# ووتەی پیشینە چاكە كان

بەلی (علماء سلف صالح ) یان زانایانی پیشینەچاكە كان ، زۆر گرنگیان بە بابەتی ئەخلاص داوە وە ئاگاداریان كردینەوە لە گرینگیدان بە ئەخلاص یان دڵسۆزی ، لەدوای ئەوەی كە خویندنەوەیان بۆ ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز و فەرموودە كانی پیغەمبەری خوا ﷺ ، بلی بی گومان كاریكی زۆر گەورەیە ، چونكە ئەوان هەستیان بە ترسناكی ئەخلاص كردووە لە كردەوە كانی رۆژانەی هەر مرۆڤیك ئەگەر ئەخلاص یان دڵسۆزی نەبیت لە گەل هەر كردەوەیە ئەوا ترسناكە زۆر بەلی ئەخلاص گرینگە لە كارو باور كردەوە كانی رۆژانە ماندا ..!!




بەلی سەرتای دەست پی كردنی بەنووسیت نووسینەوەی فەرموودە كانی پیغەمبەری خوا هەروەها نووسینی پەتووكیك لە سەر فەرموو دەی پیغەمبەری خوا ﷺ كە دەفەرموویت : (( إنما الأعمال بالنيات )) .[28]



( ئەمامی بوخاری محمد كوری اسماعیل البخاری ) (١٩٤– ٢٥٦) بەرانبەر ٨١٠–٨٧٠م

[28]_ صحيح البخاري برقم (١٩٠٧).

له (عبدالرحمن بن مهدی ) – ڕەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت :



نیوەی پەرتووکە کەم بە فەرموودەکەی (عمری کوری خەتاب ) نووسیەوە کە

لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( إنما الأعمال بالنيات )) . [29] بەلی بی گومان ئەم فەرموودەیە بناغەی هەموو کاریك یان بۆ هەموو سەرە باسیك یان دەست پیکی هەموو کاریکە کە مرۆڤ پیش دەست پیکردنی دەبیت نیەت و ئەخلاص هەبیت یان دلّسۆزی هەبیت بووی کە هەر کاریك ئەنجام بدات چونکە هیچ کردەوەیەك بی ئەخلاص سوودی بۆ خاوەنەکەی نابیت ،چونکە ئیخلاص کرۆك و بنچینەو بناغەی هەموو کردەوەکانە ..!!

هەروەك ئە گەر روون تر بکەینەوە ، نیەت گرینگترە لە کارە کە خۆی یان لە کردەوە کە خۆی ..!!



له (يحيى بن أبي كثير ) –ر ەحمەتی خوای لی بیت– دەلیت:

( نیازپاکی فیر بە چونکە ئاگادار بە سوودی زیاترە لە کردەوەکە).[30]

بەلی بی گومان زانایان پیشینە چاکە کان یان زانایانی ئیسلام ، زۆر جەختیان یان زۆر پشت راستیان کردۆتەوە لەوەی کە زۆر گرنگی بە بابەتی ئەخلاص یان دلّ سۆزی بدەن ، بۆ ئەوەی خەلکی فیری ئەخلاص یان دلّسۆزی بکەن بۆخوای تاك و تەنها ..!!

---

[29] جامع العلوم والحكم (٨/١).

[30]



له (ابن أبي جمرة ) –رەحمەتی خوای لی بیت – دە لیت :

(ئاواتم ئەوە یە ئەگەر زانایانی فقه یان زانایانی شەرع ،تەنها کاریك بکەن ، ئەویش فیر کردنی خەلك بۆ نیاز مەبەستە کانیان له کارو کردەوە کانیا دا فیری مەبەست و نیاز بن ، دابنیشن تەنها وانەی نیەت پاکی یان نیاز پاکی بۆ خەلك بلینەوە بە تەنها بەسە).[٣١]

بەلی چونکە زۆریك لە خەلکی ئەم وانەیان یام ئەم دەرسەیان بەفیرۆداوە .

## وە لە لایەکی تریشەوە (خوای گەورە ) سە رزەنشتی ئەهلی (ریاء ) دە کات :



(خوای گەورە ) سەرزەنشتی ئەو کەسانە دەکات کە ژیانی دونیایان زیاتر لا مەبەستە کە :

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : (( مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فِيهَا وَهُمۡ فِيهَا لَا يُبۡخَسُونَ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ)) هود ١٥-١٦ .

واتا: مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا هەر کەسێك کە لە دونیادا ئەژێ مەبەستی تەنها ڕازاوەیی و جوانی ژیانی دونیا بێت و بۆ دونیا بژێ نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا ئەوا کردەوەکانیان بەتەواوی پێ ئەدەین و دونیایان بۆ ئەڕازێنینەوەو دەستیان ئەخەین وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ وە لە دونیادا وایان لێ ئەکەین کە هیچ شتێکیان کەم نەبێ لە ڕزق و ڕۆزی و لەش ساغی و هێمنی و ئارامی، ئەم ئایەتە لەسەر جولەکەو گاور دابەزیوە، وە وتراوە لەسەر ریابازەکان دابەزیووە

[ أُولَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ إِلَّا النَّارُ ] بەڵام ئەم کەسانە لە ڕۆژی دوایی جگە لە ئاگری دۆزەخ هیچ شتێکی تریان بۆ نیە لەبەر ئەوەی ئەوان بۆ دونیا ژیاون و قیامەتیان نەوویستووە [ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا وَبَاطِلٌ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٦) ] وە ئەگەر کردەوەیەکی چاکیشیان کردبێت بۆ مەبەستی دونیاو ناوبانگ هەمووی بەتاڵ و پووچەڵ ئەبێتەوە..!!

---

[٣١] المدخل (١/١).

### (خوای گەورە ) سەرزەنشتی ئەوانە دە كات كە مەبەستی دونیا بیت

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ((مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومًا مَّدۡحُورًا ))
الاسراء ١٨

واتا: مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَنْ نُرِيدُ هەر كەسێك لە ژیانیدا مەبەستی دونیا بێت و بۆ دونیا هەوڵ بدات ئەوە ئێمەش بۆ هەر كەسێك كە ویستمان لێ بێت و بمانەوێت بۆی پێشئەخەین و لە دونیادا پاداشتی ئەدەینەوە [ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلَاهَا مَذْمُومًا مَدْحُورًا بەڵام پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا دۆزەخمان بۆی داناوە كە ئەچێتە ناویەوە كەزەمكراوەو دەركراوەو دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوای گەورە.

### (خوای گەورە ) بە و كەسانە دەفەرموویت : ئەوەی دونیاییدەویت یان ئەوەی دوارۆژی دەویت:

(خوای گەورە ) دەفەرموویت: (( مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ)) الشورى ٢٠ .

واتا: مَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ هەر كەسێك بە كردەوەكانی مەبەستی پاداشتی ڕۆژی قیامەتە ئەوە ئێمە

پاداشتەكەی بۆ زیاد ئەكەین و چەند قاتێكی ئەكەین: یەك بە دە تا یەك بە حەوت سەد تا زیاتر  وَمَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وە ئەوەیشی بە كردەوەكانی مەبەستی پاداشتی دونیایە ئەوە لە دونیادا پێی ئەبەخشین  وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ نَصِيبٍ بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ بەش و پاداشتێكی لە خێرو چاكە نابێت لەبەر ئەوەی بۆ دونیا هەوڵی داوە ..!!

له (محمود بن لبيد الانصارى ) – خوا لى رازى بيت – دەليت: له پيغەمبەرى خوا ﷺفەرموويەتى :

**(( إن أخوف ما أخوف عليكم الشرك الأصغر )) . قالوا : ما الشرك الأصغر يا رسول الله ؟!**

**قال: (الرياء) يقول الله (عز وجل) لهم يوم القيامة إذا جزي الناس بأعمالهم : اذهبوا إلى الذين كنتم تراء ون في الدنيا ، فانظروا هل تجدون عندهم جزاء )) .** [٣٢]

واتا: پيغەمبەرى خوا ﷺفەرمووى : ئەو تاوانەى كە زۆر لەسەرتان دە ترسم ئەنجامى بدەن (شيركى يان هاوەلدانان) بچووكە ..!! پرسيارى ليكرا سەبارەتى بە شيركى يان هاوەلدانانى بچوو ؟! فەرمووى (رياء) يان روو پەمەيى ، هەروەها فەرمووى : (خواى گەورە ) لە رۆژى قيامەتدا پاداشت بە گويرەى كردەوە كان دە دان ،برۆن بۆلاى ئەو كەسانەى كە خۆيان نيشان دەدا بۆ ژيانى دونيا ، ئايا هيچ پاداشتيكيان دەست دەكەويت جگە لەوەى كە بۆ دونيا كردويانە ، ئەوانە تەنها بۆ دونيا كارو كردەوەيان ئەنجام داوە ، خەسارەت مەندى ژيانى دوا رۆژن چونكە كردەوى دوا رۆژيان ئەنجام نە داوە ، تەنها مەبەستيان پاداشتى دونيا بووە ..!!

روون كردنەوەى ئەم فەرموودەيە :

هەر بۆيە پيغەمبەرى خوا ﷺئۆمەتەكەى ئاگادار كردۆتەوە لە تاوانى (رياء) يان روو پەمەيى لە لاى خەلك ئەنجام دانى ئەم كردەوەيە كە خاوەنەكەى ئەنجامى دەدات تەنها بۆ خەلكە خەلك پى بلين ئەو كارەى كردوويەتى كاريكى باشە ، نەوەك ئەخلاصى هەبيت لە كردەوەكانى تەنها بۆ رەزامەندى خواى گەورە بيت ، يان بۆ وەرگرتنى پاداشتى دونيا ، بەلى ئەوەى بۆ دونيا هەر كاريك بكات (ريايى ) تيدا بيت ، ئەوا دەبيتە هۆى زيان بۆ دوارۆژى خۆى ، چونكە (رياء) رووپەمەى ترسناكترە بۆ سەر پياو چاكان زياتر لە فتنەى دەجا ، وە دەبيتە هۆى شيرك و هاوەلدانان بۆ خاوەنەكەى ، هەر بۆيە شير هاوەلدانان دابەش دەبيت بۆ دوو جۆر : شيركى گەورە ، شيركى بچووگ ، شيركى گەورە: ئەويش ئەوەيە كە كەسيك يان شتيك يەك سان بكەيت بە (خواى گەورە ) لە ناو صيفە تەكانى (خواى گەورە) بەلام شيركى بچووك: ئەوەيە كەلە دەقەكانى قورئان و فەرموودە دا هاتووە ناگاتە ئاستى شيركى گەورە ، وە جياوازى نيوان شيركى گەورە بچووك ئەوەيە شيركى گەورە هەموو كردەوە كان پوچەل دە كاتە وە ، وە هۆكارى مانەوەى هەتا هەتايى لە ئاگرى دۆزەخدا ، بۆنموونە وەك : دەرچوون لە ئاينى ئيسلام هەلگەرانەوە و نويژ نەكردن يان تارك الصلات ، شيركى بچووك ئەو كردەويە پوچەل دە كاتەوە كە لە گەلى دا ئەنجامى داوە وە (رياء ) وە نابيتە هۆكارى مانەوەى هەتاهەتايى لە ئاگرى دۆزە خدا ..!!

---

[٣٢]_ رواه أحمد برقم (٢٣٦٨١) صصحه الالباني

بەلی جا ئەی برای موسلمان ئەی خوشکی موسلمان ، تۆ بۆ خوت ریگە یەك هەلبژیرە لە دوو ریگەیە کە لە فەرموودە کە ی پیغەمبەری خوا ﷺدا هاتووە ، جا ئەوەیە تۆ بۆ ژیانی دونیا کارو کردەوە چاکە کان ئەنجام دە دەیت یان ئەوەتە بۆ ژیانی دوا رۆژ ئەنجامیان دە دەیت ن چونکە هەر کەسیك دوو ریگای لە بەردەم دایە یان ئەوە تا دونیا پەرستە واتە : ( ریاء ) و ریاء بازی رووپەمەی بۆ ئەوەی بەلین بەخوا پیاویکی خانە داباشە یان ئافەرتیکی باش و خانەدانە ، بەلی بی گومان ریگەی قیامەت زۆر قورسە بۆ ژیانی دونیا گەر هەر کەسیك بگریتە بەر دەبیت ئارام گربیت ئەخلاص نیەتی پاکی هەبیت بۆ ئەوەی لە دونیا دا بەرەو ریگای قیامەت ری بگریتە بەر زۆر سەختی تیدایە دەبیت دان بە نفسی خۆ بنی بۆ ئەوەی ریگای دوارۆژ بگریت چونکە ریگای دوارۆژ یان قیامەت ئەو ریگایە بۆ هەتا هەتاییە ژیانیکی نەبراوەیە ،هەر ئەم ریگایەش ریگای سەرفرازی سەرکەتنە ، چونکە ریگای ژیانی دونیا زۆر کورتە زۆر کەمە تەنها جیژیکی کەمی هەیە ، بەلام ئیمەی مرۆڤ ئەوەندە سەرلی شیواوین بیر لە دوا رۆژ ناکەینەوە دەچین ژیانی دونیا هەلدەبژیرین بۆئەوەی تەنها پیمان بلین بەخوا کەسیکی باشە یان کردەوەیەکی باشی ئەنجامدا گوی شلدەکی بۆ مەدحو پیا هەلدانی خەلك ، نە بۆ رەزامەندی (خوای گەورە ) تا چەند لە کردەوە کانمان رازیە ، هەر بۆیە ریگای ئەخلاص و دلّ سۆزی ریگایەکی راستە قینە یە کە مەبەست لی تەنها لە پیناوی خوا دابیت بۆ سەر خستنی ئاینەکەی وە پەرستنی خوای گەورە بە تنها ، هەموو کردەوە کان لە پیناوی خوی گەورە دا بیت سەرخستنی پەیمای خوای گەورە پیغەمبەرە کەی ﷺ، ئەمەیە ریگای سەرفرازی ریگای ئەخلاص و نیەت پاکی دلّسۆزی بۆ (خوای گەورە ) ، بەلام ریگا (ریاء ) ریگایەکی زۆر نەفامی نەزانیە کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات دەبیتە هۆی شیرکی بچووك بۆ خاوەنەکەی ، چونکە خاوەنەکەی مەبەستی دونیایە نەك دوارۆژ ، هەر وەکو دە زانین خەلکی کە لە گۆر دەدەهینرین لەسەر نیەت و کارو کردەوە کانیان کە لە دونیادا ئەنجامیان داوە ، هەر وەك ئەم فەرموودەیە پیغەمبەری خوا ﷺدەفەرمووی : (( **إنما يبعث الناس على نياتهم** )) .[٣٣] واتا:خەلکی زیندوو دەکرینەوە لەسەر نیەتەکانیان لە گۆر دا . هەر بۆیە خەلکی ئەگەر میل و ئارە زوو نفسیان لە (ریاء ) بیت ئەوا تووشی هیلاکەت دەبن وە لەگەل ئەوانەی کەلەسەر (ریاء ) تووشی هیلاکەت زیان مال ویرانی بوونە لە گە ل ئەوان دا حەشر دە کرین ..!!

ریگای قیامەت یان ریگای دونیا



[٣٣] رواه ابن ماجه برقم (٤٢٢٩).

# بەرهەمەكانی ئەخلاص

بی گومان وه لە پیشدا باسمان كرد كە كرۆكی ئەخلاص بریتیە لە : پالفتە كردنی یان پاكردنەوەی كردەوە كانی (دڵ) لە هەر خەوشو خاڵ پی سیەك دا ، واتە كردەوە كان بە خەلتەو خەوشی ویستی دەروون تیكەڵ نەبیت ، هەر بۆیە ئەخلاص یان دڵ سۆزی بەرهەمی زۆری هەیە ، بۆ ئەو كەسەی كە بە تەواوەتی ئەخلاصی لە دڵ دەروونی دایە ، هیچ شتیك ناكات بی ئەوەی ئەخلاصی لە گەل دانەبیت ، چونكە دەزانیت سودو بەرهەمی ئەخلاص چۆنە و چەندە بۆ ئەو كەسەی كە بە تەواوی ئەخلاصی لە سینە و دلی دایە ، ئەخلاصی یان دڵسۆزی تەواو لە دڵی بەندەی باوەر دا و چاكە كار سودو پاداشتی زۆر لەسەری وەردەگریت ،لە دوارۆژ داو لە ژیانی دونیاش ، بەلام بەو مەرجەی كە كردەوە كانی تەنها بۆ رەزامەندی (خوای گەورە ) بیت تەنها بۆ ئەو زاتە ئەخلاصی هەبیت ، هیچ ریاء و هیچ پیسیەكی ئارەزووی دونیایی تیدا نەبیت ، چونكە هەر ئەخلاصیك یان دڵ سۆزیە ك كە بەندە بۆ خوای گەورە دەكات ، ئەوا شەرم كردنە لە كردەوە كانی بە ئەخلاصی دەیكات چونكە هەر كاریك كە دەیكات ئەگەر بەشیاوی نەزانیت لەبەرانبەر زاتی (الله ) شەرم كردن لی ئەوا ئەخلاصی تەواوە بۆ خاوەنەكەی ، چونكە ئەخلاص بریتیە لە رازی بوونی نفسی خۆی دووپات كردنەوە ی بۆ زاتی (الله ) لە كردەوە كانی دا ، هەموو كاتیك نەفسی خۆی تۆمەتبار دەكات بەوەی ئایا..؟! ئەخلاص هەیە لە كردەوە كانی یان نا ...!! هەر بۆیە سودو بەرهەمی ئەخلاص زۆرە ئەگەر هەر باوەر داریك لە خۆی دا بەدی بكات ، بە لی كەسیك كە ئەخلاصی تەواوی هەبیت ئەوا بینینی كردەوە كانیەتی لە بەرانبەر ئەخلاصی بۆ (خوای گەورە) هەروەها فەزل و كۆمەكی (خوای گەورە ) بۆ ئەو كەسەی كە ئەخلاص لە كار كردەوە كانی دایە ، چونكە ئەگەر (خوای گەورە ) كۆمەكی نەكات لە كارو كردەوە كانی دا نەفسی خۆی هیچی بۆ ناكات ، ئەوەی ویستی خودایە ئەوە كارە كەی خیری پی دەگات ، ئەوا كۆمەكی پالپشتی (خوای گەورە ) بۆ ئەنجام دانی هەر كاریكی خیرو چاكە ، نەوە ویستی بەندە ، ئەوەش بەرهەمی ئەخلاص دە بیتە كۆمەكی پالپشتی (خوای گەورە ) بۆ بەندە ، كە (خوای گەورە ) دەفەرموویت: ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴾ التكوير ٢٩

واتا:ویستی ئیوەش نایەتە دی مە گەر كاتیك پەروەردگاری جیهانیان بیەویت ، هەر كەس ویستی خیری هەبیت (خوای گەورە ) سەربەستی لی زەوت ناكات ، لە گەل ئەوەش دا هەر ئەوەش پیش دیت كە ویستی (خوای گەورە)ی لەسەرە وتوانای تیگەشتنمان لە نهینی و شاراوەكان زۆر سنوور دارە .

## چواردەم : ئەگەر ئەخلاص و نیازی پاکت هەبێت ئەوا هەڵەش بکەیت ئەجرو پاداشت وەردەگرێت لەسەری :

بۆ نموونە ئەو کەسەی کە زانایەکی شەرع زانە لە بواری فقە ئەجتهاد دەکات لەسەر بابەتێک یان جیاوازیەك دا ، ئەوا تەنا مەبەست و ئەخلاصی بلاو کردنەوەی پەیامی (خوای گەورە ) یە بابەتە کە فراوان دەکات بەلام هەلەی تیدا دەکات ، مەبەستی نیە هەلە بکات ، بەلام بەهۆی لە بیر چوونەوەی یان نەزان لە سەر بابە تە شەرعیە کدا ، لە راستی دا مەبەست و نیەتی هەلە کردن نیە ، بەلام هەلەی تیدا کردووە ، کەچی مەبەست نیاز و ئەخلاصی تەنها لە پیناوی خوا دایە ، بۆ بلاو کردنەوەی پەیامی (خوای گەورە ) کە ئەجتهادی تیدا کردووە ، بەلام ئەگەر هەلەشی تیدا کردبیت ئەوا (خوای گەورە ) بۆ بە ئەجرو پاداشت حیساب دەکات وە ئەجرو پاداشتی لە سەر وەردەگریتەوە ، بەلی نموونەی زۆر هەن لە زانایان ئاینی ئسلام ،کاتیك فتوایەکیان داوە بەلام دواتر بۆ یان روون بووە تەوە کە تیدا لەم فتوایە یان لەم بابەت هەلەیان کردووە ، ئەوا یەکسەر تۆبەیان کردووە ، لەسەر هەلە کەی خۆیان پاشگە بوونەتەوە هەلە کەی خۆیان راست کردۆتەوە ، بەلام (خوای گەورە ) ئەجرو پاداشتیان لەسە ر ئەم هەلە یە دەداتەوە ، چونکە ئەجهادیان کردووە شەو نوخونیان لە سەر ئەرك کارو پیشە کەی خۆیان کردووە ، تەنها مەبەستیان لی رەزامەندی (خوای گەورە ) یە ئەخلاصی تەواویان هەبووە بۆ کارە کەیان بەدوای زانست و زانیاری تەواو گەراون بەلام تیدا هەلە یان کردووە ,ئەوا (خوای گەورە) پاداشتیان دەدا تەوە ..!!

بۆنموونە لەم فەرموودە یە پیغەمبەری خوا ﷺدا هاتووە کە دەربارەی ئەجتهادی دادوەر لە پیشە کەی خۆی دا ئەگەر هەلەی کرد ئەوا یەك ئەجرو پاداشت وەر دە گریت لەسەری ..!!

سُنَن أَبی دَاوُد

لە (عمری کوری العاص ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت :لەپیغەمبەری خوا ﷺفەرموویەتی :



(( إذا اجتَهَد فأصاب فله أجرانِ، وإن اجتَهَد فأخطَأَ فله أجرٌ)) .[٥٢]

واتا:ئەگەر ئەجتهادە کەی پیکا ئەوا دوو پاداشت وەردەگریت لەسەری ،

ئەگەر هەلی کرد لەسەر پیکانەکەی ئەوا یەك پاداشت وەردەگریت لەسەری ..!!

---

[٥٢] _ سنن ابي داود برقم (٣٥٧٤)

# پانزه‌هه‌م : هه‌موو خێروك و چاكه‌یه‌ك له ئه‌خلاص دایه :

له ( داو د الطائي ) – ره‌حمه‌تی خوا لی بیت – ده‌ڵیت :

(( هه‌موو چاكه و خیره كان ده بینم ، ئه‌وه‌ی هه‌مووی كۆده‌كاته‌وه نیه‌تی باشه یان نیه‌تی پاكه ، وه به‌سه بۆ خیرو چاكه ، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر دانه‌مه‌زاربیت یان ئه‌گه‌ر ریكیش نه‌خرابیت )). [٥٣].

جا ئه‌ی به‌نده‌ی موسلمان خۆت ئازاد بكه یان خۆت هه‌ڵبژیره بۆ ئه‌وه‌ی له ئه‌هلی ئه‌خلاص دا بیت ، مادام ئه‌و هه‌موو سوده‌و به‌رهه‌مه هه‌موو له دڵ سۆزه كانه‌وه‌یه ، كه‌له پیشنه چاكه كان ئه‌خلاص و دڵ سۆزی ته‌واویان بۆ ئه‌م په‌یامه‌ی پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ هه‌بوو ، كارو كرده‌وه و نووسینه كانیان و خزمه‌ت كردن به ئیسلام ته‌نها له دڵ سۆزیان بۆ ئه‌م ئاینه هه‌موو خزمه‌تیكیان كردووه ، بۆیه ده‌بیت وانه و ئامۆژگاری له پیشینه‌چاكه كان وه‌ر بگرین كه‌چۆن ئه‌خلاص و نیه‌ت و نیازی پاكیان به كار هیناوه له كرده‌وه‌كانیاندا له ده‌ست نووسه كانیان كه چه‌نده په‌رتووكیان نووسیه‌وه بۆ خزمه‌ت كردنی ئاینی ئیسلام پیرۆز ، هه‌روه‌ها بلاو بوونه‌وه‌ی ئه‌م ئاینه پاكه به هه‌موو جیهاندا ، شوینك نه‌ماوه ئاینی ئیسلامی تیدا بلاو نه‌بیته‌وه ، ئه‌مش به هۆی ئه‌خلاصی پیاو چاكان و پیشینه چاكه كانی ئه‌و ئۆمه‌ته‌یه ، هه‌ر بۆ یه هه‌و ل و كۆشه شو ته‌قه‌لایان بۆ خزمه‌ت كردنی په‌یامی خوای گه‌وره و پیغه‌مبه‌ره كه‌ی بوو ﷺ، ئه‌ویش به ئه‌خلاصی ته‌واو به‌نیه‌تیكی زۆر پاك بیگه‌ر د ، به‌لام ئه‌گه‌ر بروانینه رابردووی پیاوچاكان و پیشینه چاكه كانی ئه‌م ئۆمه‌ته ده‌بینین ، زۆربه‌یان تووشی ده‌ر ده‌سه‌ری ناره‌حه‌تی هاتوونه له به‌رانبه‌ر تاغووتان زالم سته‌م كاران ،چونكه هیچ كاتیك ئاین له‌به‌رژه‌وه‌ندی ئه‌وان نابیت دوژمنی خوا و پیغه‌مبه‌ركه‌ی خوان ، له‌وه‌ته‌ی ئاینی ئیسلام هاتووه به‌دریژایی میژوو دژی ئیسلام پیاوچاكان بوونه‌ته‌وه ، له‌سه‌رده‌می هاتنی ئیسلام دا تاكو ئیستا ، به‌لام سوپاس بۆ خوا به هیمه‌تی پیاو چاكان پیشینه‌چاكه‌كان ئه‌م ئاینه رۆژه به‌رۆژ به‌ره‌و زیاد بوون ده‌جیت ، ئه‌وه ئه‌خلاص و نیه‌تی چاكی ئه‌وان شكۆ سه‌ر به‌زی به ئیسلام به‌خشیه‌وه ، منیش ریچكه‌ی پیاو چاكان ده‌گرمه به‌ر ته‌نها به ئه‌خلاص له پیناوی خوادا ئه‌م په‌ر تووكه ده‌نووسم ، له خوای گه‌وره ده‌پاریمه‌وه كه لی قبول بكات ..!!





[٥٣] _ الاخلاص والنية (٦٤) و جامع العلوم والحكم (١٣).

# زیانە کانی نەبوونی ئەخلاص

هە روەك پیشتر زانیمان کە ئەخلاص برهەم و سودی زۆرە بۆ ئەو کەسەی کە ئەخلاصی تیدا بەدی دەکریت ، بە پیچەوانەوە ئەو کەسەب کە کە نە بوونی ئەخلاص لە دڵ دەروونی دانیە ، ئەوا زیانی گەورەی لی دە کەویت لە ژیانی دونیا لە دوا رۆژ دا ، بەلی زیانی نەبوونی ئەخلاص کە پیویستە بە خاوەنە کەی ئەویش زیانی یەکجار زۆری هەیە ، چونکە هەموو کارو کردەکانی ئادەمیزاد پیویستە بە ئەخلاصی تەواو هەیە ، هەر کاریك کە مرۆڤ ئەنجامی دا بە بی ئەخلاص سودی بۆ نابیت بەلکو دەبیتە زیان بۆ خاوەنەکەی ، دەبیت لە هەموو کارو فەرمانیدا ئەخلاص مان هەبیت و دڵ سۆز یمان تیدا بەدی بکریت ، وە ك فەرمان کردن بە چاك و پەرستنی خوای گەورە بە تنها و نزاو پارانەوە کانمان و ، هەروەها کاری رۆژانەمان تیدا بی ئەخلاص موفق و سەرکەوتو نابین ئەگەر ئەخلاص و دڵ سوزی و نیەت و نیازی پاك و بی گەرمان بۆی نەبیت ، چونکە پیش ئەنجامدان هەر کاریك هەر فەرمانیك دەبیت خۆمان یەك لا بکەینەوە ئایا ئەم کارە مان بۆ (خوای گەورە ) یە و ئایا راست گۆین لە فەرمان و کارەکانمان دا ، ئەم راست گۆیە واتای ئەخلاص و نیاز پاکی بۆ خوای گەورە ، لە هەر شتیکدا ئەخلاص و نیەتی پاك هەبیت ئەوا سەر کەوتوو دەبین لە کارە کانماندا ، بەلام ئەگەر ئەخلاص و نیەتی پاك نەبیت ئەوا تووشی زیانیکی زۆر گەورە دەبین لە ژیانی دونیا لە رۆژی قیامەت دا سەرئەنجامی ئاگری دۆزەخە نەبوونی ئەخلاص.

# یەکەم : ناچینە ناو بەهەشتەوە



لە ( ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت – دە لیت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ:

(( مَن تَعلَّمَ عِلْمًا ممَّا يُبتَغى به وَجهُ اللهِ عزَّ وجلَّ، لا يَتعلَّمُه إلَّا لِيُصيبَ به عَرَضًا مِنَ الدُّنيا؛ لم يَجِدْ عَرْفَ الجَنَّةِ يَومَ القيامةِ. يَعني: ريحَها )) . [٥٤]

واتا: پیغه مبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( هەر کەسیك زانستیکی شەرعی فیر ببی خۆی دەبی مەبەست لە فیر بوونی ئەو زانستە لەبەر رەزامەندی (خوای گەورە ) بی ، بە لام ئە و کەسە بۆ ئەوەی خۆی فیر بکات شتی لە ماڵ و سامانی دونیایی دەستکەویت ، ئەوە کەسە لە رۆژی قیامەت دا بۆنی بە هەشت ناکات ..!!

روون کردنەوەی ئەم فەرموودەیە : ئەوە یە کە نیەت و ئەخلاص ئەوە بیت بۆ دونیا شتیك بە دەست بهینی نە ك بۆ رەزامەندی (خوای گەورە) ئەخلاصی بۆ خوا نەبیت نە بوونی ئەخلاص لە کاور پیشە کەی دا دەبیتە زیان بۆی لە رۆژی قیامەت دا ، ئەوا ئەو کەس ناچیتە بەهەشتەوە تەنانەت بۆنی بەهشت ناکات کە بۆنە کەی چەندها سار ری یە ...!!!

ئەگەر ئەخلاص و دڵ سۆزیت نەبیت بۆنی بەهەشت ناکەیت



---

[٥٤] _ سنن ابو داود برقم (٣٦٦٤ ) .

## دووەم : لە رۆژی قیامەت دا دەچنە ئاگری دۆزەخەوە



لە ( ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت – دە لیت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ:

((إنَّ أوَّلَ النَّاسِ يُقْضَى يَومَ القِيامَةِ عليه رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ، فَأُتِيَ به فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَها، قالَ: فَما عَمِلْتَ فيها؟ قالَ: قاتَلْتُ فِيكَ حتَّى اسْتُشْهِدْتُ، قالَ: كَذَبْتَ، ولَكِنَّكَ قاتَلْتَ لأَنْ يُقالَ: جَرِيءٌ، فقَدْ قيلَ، ثُمَّ أُمِرَ به فَسُحِبَ علَى وجْهِهِ حتَّى أُلْقِيَ في النَّارِ، ورَجُلٌ تَعَلَّمَ العِلْمَ، وعَلَّمَهُ وقَرَأَ القُرْآنَ، فَأُتِيَ به فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَها، قالَ: فَما عَمِلْتَ فيها؟ قالَ: تَعَلَّمْتُ العِلْمَ، وعَلَّمْتُهُ وقَرَأْتُ فِيكَ القُرْآنَ، قالَ: كَذَبْتَ، ولَكِنَّكَ تَعَلَّمْتَ العِلْمَ لِيُقالَ: عالِمٌ، وقَرَأْتَ القُرْآنَ لِيُقالَ: هو قارِئٌ، فقَدْ قيلَ، ثُمَّ أُمِرَ به فَسُحِبَ علَى وجْهِهِ حتَّى أُلْقِيَ في النَّارِ، ورَجُلٌ وسَّعَ اللَّهُ عليه، وأَعْطاهُ مِن أصْنافِ المالِ كُلِّهِ، فَأُتِيَ به فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَها، قالَ: فَما عَمِلْتَ فيها؟ قالَ: ما تَرَكْتُ مِن سَبِيلٍ تُحِبُّ أنْ يُنْفَقَ فيها إلَّا أنْفَقْتُ فيها لَكَ، قالَ: كَذَبْتَ، ولَكِنَّكَ فَعَلْتَ لِيُقالَ: هو جَوادٌ، فقَدْ قيلَ، ثُمَّ أُمِرَ به فَسُحِبَ علَى وجْهِهِ، ثُمَّ أُلْقِيَ في النَّارِ )) . [٥٥]

واتا: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : یە کەم کەس کە دادگای دە کریت لە رۆژی قیامەت دا پیاویکە شەهید بووە ، دە هینریت ، (خوای گەورە) نازو نیعمەتەکانی خۆی پی دەناسینی و ئەویش دانی پیدا دەنیت ، (خوای گەورە ) دەفەرموویت :دەی باشە چیت تیدا کردووە ؟! ئەویش دەلیت : جەنگ کردووە لە پیناوی تۆ دا تا وەکو شەهید بووم ، (خوای گەورە) دەفەرموویت : درۆ دە کەیت ، بەلکو تۆ بۆ ئەوە جەنگ و جیهاد کردووە پیت بلین بە خوا کە سیکی ئازایت ئەویش لە دونیا دا ئەمەت پی ووترا ..!! ئینجا فەرمانی پیدەدریت دەمەو رووکیش دە کری وفری دەدریتە ناو ئاگری دۆزەخەوە .!! هەر وەها پیاویکیش فیری جەند جۆرە زانستیك بووە خەلکیشی فیر کردووە و قورئانی خویندەوە ، ئەویش دە هینریت و باسی نازو نیعمتەکانی خۆی بۆ دەکات وە پی دەناسینی ئەویش دانی پیدا دەنیت ، (خوای گەورە ) دەفەرموویت: دەی باشە چیت تیدا کردووە ..؟! ئەویش دەلیت فیری زانست بووم و خەلکیشم فیرکردووە و لە بە رخاتری تۆ وە قورئانیشم خویندوە ، (خوای گەورە ) پی دەفەرموویت : درۆت کرد ، بە لکو بۆ ئەوە فیری زانست بووی تا کو بیت بلین زانایە ..!!

---

[٥٥] _ صحيح مسلم برقم ( ١٩٠٥ ) .

قورئانیشت بۆ ئەوە خویند تا پیت بلێن : قورئان خوینەو دەنگی خۆشە ، ئەوەش لە دونیا دا پیت ووترا ..!! پاشان (خوای گەورە ) فەرمان دە کات کیش دە کریت دە مەو روو فڕێدەدریتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ..!! پیاویکش (خوای گەورە) دەرووی خێر بەرکەتی لی دە کاتەوە لە هەموو جۆە مال و سامانیکی پی بەخشیوە و دەهینریت و نازو نیعمەتەکانی خۆی پی دە ناسینی و ئەویش دانی پیدا دەنی ، (خوای گەورە ) دەفەرموویت : باشە چیت کردووە .؟! ئەویش دەلی: هیچ ریگەیەکم نەهیشتووەتەوە کە تۆ پیت خۆش بیت مالی تیدا بەخت بکریت نەم گرتبیتەبەر لە پیناوی تۆ دا ، (خوای گەورە ) دە فەرموویت : درۆت کرد ..؟! بەلکو تۆ بۆیە وات کردوو تا کو بیت بلێن : کەسیکی بەخشندە و نان دەری ، ئەویشت لە ژیانی دونیادا پی ووتراوە ..!! پاشان فەرمان دەکریت دەمەو روو کیش دەکریت و فری دەدریتە ناو ئاگری دۆزخەوە ..!!

روون کردنەوەی ئەم فەرموودەیە :بی گومان هەر کاریك کە ئادەمیزاد ئەنجامی بدا ئەوا (خوای گەورە) لە سەر پنچینەو بناغەی ئەخلاص و نیەتی پاك وەری دە گریت ،نموونەی ئەم سی پیاوەی کە پیغەمبەر خوا صلى الله عليه وسلم بۆ مانی باس کرد ، کە سەرئەنجامیان چۆن بووە ، ئەو سی کەسە کارە کانیان ئەکجارە گەورەیە بەلام بە هۆی نەبوونی ئەخلاص بۆ خوای گەورە ئەوا دە خرینە ناو ئاگری دۆزەخەوە ، ئەمەش سەر ئەنجامی هەموو (رياء) بازیکە کە ئەخراصی تەواوی بۆ خوا نەبیت ،



نە بوونی ئەخلاص و نیەت ئەگەر جیهادیش بکات سەر ئەنجامی دۆزەخە





نەبوونی ئەخلاص و نیەت ئەگەر خەلکیش فیری زانست بکات سەر ئەنجامی دۆزەخە





نەبوونی ئەخلاص و نیەت ئەگەر هەموودونیا بکاتە خێر سەر ئەنجامی دۆزەخە



لەم فەرموودیە دا هاتووە ترسناکی گەران بەدوای  زانست بۆ دەست خستنی دونیاو خۆ دەرخستن و موجادەلە کرد :

لە ( کعب کوری مالك ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : لەپیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :

(( مَن طلبَ العلمَ ليجاريَ بِهِ العلماءَ أو ليماريَ بِهِ السُّفَهاءَ ويصرفَ بِهِ وجوهَ النَّاسِ إليهِ أدخلَهُ اللَّهُ النَّارَ)) .[٥٦]

واتا: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە تی : هەر کەس بەدوای زاستدا بگەری بە مەبەستی ئەوەی موجادەلە بکات لە گەل زانایاندا و خۆی دەر بخات بۆ دونیا یان مشتومر و دەمەدەمی بکات لە گەل نەزاناندا یا رووی خەلکی پی وەرگیری بۆ لای خۆی ، ئەوا ( خوای گەورە ) دەیخاتە نا و ئاگری دۆزە خەوە ..!!

روونکردنەوەی ئەم فەرموودەیە : مەبەست لی گەران بەدوای زانستی شەرعی بۆ بەرژەوەندی خۆی بە کاری بینیت ، سودی دونیا لی  ببینیت ، هەورەها بە کار هینانی ئەم زانستە بۆ ئەوە بیت کە موجادەلەمشتو مرو دەمەدەمی بکات ، یان مشتو مەر بکات لە گەل زانایاندا ، بۆ خۆ دەر خستنی خۆی ، ئەم هیچ کردەوەیەکی باش نەیە بەلکو بەپی ئەم فەرموودەیە دە خریتە ناو ئاگی دۆزەخەو ، هەروەك لەم سەردەمە دا ئیستا زۆر باوە کەسیك زانستیکی شەرعی پیە بە باشی بە پوختی بەکاری نەهینا تەنها بۆ خۆ دەرخستنی خۆی نەبیت ، جا سەیرە کەلەوەدایە دەست دەکات بە مشتو مەر لەگەل زانایان دا، هەر لەخۆ را فتوادە دات خەلك دەکات بە کافرو ئەوەی لەسەر بیرو رای ئەوە ئەم بەپیاو چاك ناویان دەبات ، بۆیە دەبیت زاستی شەرعی وەکو خۆی کە خوا و پیغەمبەرەکەی ﷺ فەرموویان جی بەجی بکەن نەکەم نەزیادرۆیی تیدابکەین.



ئاگادار بە با زانستەکەت بەخلاص بیت تەنها بۆ خوا  بیت نەوەك بۆ دوینا بیت،
چونکە سەر ئەنجامی زۆر خراپ دەبیت ، دەبیت بە ئاگر  بۆهەتاهەتایی ...!!



ئەمەش زانستیك بۆ دونیا سەر ئەنجامی  روو رەشیە بۆ ناو دۆزەخە

[٥٦]سنن الترمذي برقم (٢٦٥٤ ) .

# سی یەم : ئەخلاص نەبێت هیچ کردەوەیەک لی وەرناگریت 



له ( ابو هريره ) – خوا لی رازی بيت – دەڵيت : له پيغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی :

(( قالَ اللَّهُ تَبارَكَ وتَعالَى: أنا أغْنَى الشُّرَكاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَن عَمِلَ عَمَلًا أشْرَكَ فيه مَعِي غيرِي، تَرَكْتُهُ وشِرْكَهُ)) .[57]

واتا: پيغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (خوای گەورە ) فەرموويەتی : من له هەموو شەريكەكان بينياز ترم له شەريك ، كەسی كردەوە يەك بكات جگە لەمنی تيدا بەشدار بكات واز له خۆی و شەريكە كەی دينم ..!!

روون كردن نەوەی ئەم فەرموودەيە : مەبەست لی له شريكە بچووكە كه دەرناچيت له ئيسلام له رووی شەرعەوە ئەمەش پيشەو كاری دوو رووە كانە كه رووی خۆيان تيدا پەمەيی دە كەن ، بەلام ئەگەر بەردەوام بيت له سەر (رياء ) بازی ئەوا سەر دە كيشيت بۆ شركی گەورە له ئيسلام دا دەچيتە دەروە ، هەروەك ئە و كەسەی كه كاريك چاكە دەكات مەبەستی پی رەزامەندی خوايە وە رەزامەندی گەورە كەشيەتی ئەخلاصی تەواو و پوختی بۆ خوای گەورە نيە ، ئەو گەورە كەشی شريك دە كات له گەل (خوای گەورە ) ئيتر ئەم كارەچاكەی لی قبول ناكريت و لی وەر ناگيريت ، دە چيتە ريزی شركی بچووك يان هاوەلدانانی بچووك ، وەك له سەردەمی ئيسلام دا له شاری مەدينە منافيقە كان يان دوور ووەكان ئەنجاميان دەدا ، چونكە بەندە پيويستە لەسەر ئەخلاصی تەواوی له پەرستن و چاكە كردن دا هەبيت تەنها بۆ خوای گەورە بەتەنها ، بۆيە (خوای گەورە ) ئاگادارمان دەكاتەوە ئەوەی نيەت و ئەخلاصی نەبيت ، ئەوا هيچ كردەوەيەكی لی وەرناگيريت ، وەنابيت هيچ (رياء ) له كردەوەكانی بەندە دا هەبيت ، وە ك دوو رووە كان نەبيت له كردەوە كانی دا ..!!

دوو روويی و (رياو ) ربازی شريكی بچووكە حەرام و قەدەغەيە سيفاتی منافقە



[57] ـ صحيح مسلم برقم (٢٩٨٥).




لە ( ابو أمامة الباهلي ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت :

(( جاء رجل إلى النبي ﷺ فقال: أرايت رجلا غزا يلتمس الأجر والذكر ، ماله ؟ فقال رسول الله ﷺ: (لا شيءَ له . فأعادها ثلاثَ مراتٍ ، ويقولُ رسولُ اللهِ : لا شيءَ له . ثم قال : إنَّ اللهَ لا يَقبلُ من العملِ إلا ما كان خالصًا ، وابتُغِيَ به وجهُه )) .[٥٨]

واتا: پیاویك هاتە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ووتی : هەوالم پی بدە ئەگەر کەسیك بەجەنگیت یان جیهاد بکات بۆ مەبەستی پاداشت و ناوبانگ و مال و سامان و دەست کەوتی جەنگی ..؟! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هیچ پاداشتیکی بۆ نیە ، سی جار ئەمەی دوو بارە کردەوە ، پیغەمبەری خوا ﷺ پی فەرموو : هیچ پاداشتی بۆ نیە ، پاشان فەرمووی : بەراستی خوا گەورە هیچ کردەویەك وەرناگریت مەگەر بە ئەخلاص و دلّ سۆزی تەنها بۆ خوا بیت و لە پیناوی ئەو دا بیت ..! ! روون کردنەوەوی ئەم فەرموودەیە : ئەو پیاوەی هاتە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ئەم پرسیارەی لی کرد ، کە مە بەست نیاز ئەخلاصی بۆ جیهاد کردن پاداشت و مال و سامان ناو بانگ و دەست کەوتی جەنگ بووە ، دە یەویت هەمووی وەرگریت ئەگەر مەبەستی پاداشت و رەزامەندی (خوای گەورە ) بیت ئەوا لە قیامەت پاداشت و ئەجری دەدریتەوە ئەگەریش مەبەستی ناوبانگ مال سامان و دەستە کەوت بیت ، ئەوا لە دونیا وەری دەگریت هیچ پاداشتیکی بۆ نیە لە قیامەت ، ئەوا بەلکو سزاش دەریت بە هۆی (ریاء ) بازیە کەی خۆ دەر خستنەکەی لە ژیانی دونیادا ، هەروەك لە فەرموودە کەدا سی جار دوو بارەی دە کاتەوە پیغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت هیچ پاداشتیك وەر ناگریت ، ئەوەش دەبیتە دلنیا بوون لەوەی کە نیەتی خراپ و نەبوونی ئەخلاصی تەواو بۆ خوای گەورە ، هیچ کردەوەیەکی چاکەش ئەنجام بدەی قبول نابیت وەرناگیریت ، بەلی هیچ کار کردە وەیەك وەرناگیرت ئەگەر ئەخلاصی نەبیت ، بۆیە پیغەمبەری خوا ﷺ ئاگادرامان دە کاتەوە لەوەی بی ئەخلاص کردەوە قبول نابیت ، دەبیت هەموو کردەوەکانمان بۆ (خوای گەورە ) بیت بی ئەوەی هیچ شیرك و هاوەلدانان و (ریاء ) ی تیدا ئەنجام بدریت ، تەنها دلّ سۆزی مان بۆ (خوای گەورە ) بیت ، لە پیناوی ئەو زاتە دا هەموو کاریکی چاکە ئەنجام بدەین بۆ رەزامەندی ئەو زاتە لە دونیا دا ژیان بکە چونکە جارە نووسمان گەرانەوەیە بۆ لای ... ( الله )




[٥٨]سنن النسائي برقم (٣١٤٠ ) .

## چوارەم : لەدەست دانەی ئەجرو پاداشت بۆکاروکردەوەکان

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴾ الفرقان٢٣ .

{کردەوەی کافران بەتاڵ و پوچەڵە} [ وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُورًا] وە کافران ئەگەر لە دونیا کردەوەی چاکیان کردبێ لە ڕۆژی قیامەت ئە یهێنین و هەمووی ئەکەین بە تۆزێکی بڵاو و بڵاو ئەبێتەوەو هیچی نامێنێت لەبەر ئەوەی بۆ خوای گەورە نەیان کردووەو پاداشتیان دەست ناکەوێ.

حديث القدسي

لە (محمود بن لبيد الانصاری ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت: لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :

(( إن أخوف ما أخوف عليكم الشرك الأصغر )) . قالوا : ما الشرك الأصغر يا رسول الله ؟!
قال: (الرياء) يقول الله (عز وجل) لهم يوم القيامة إذا جزي الناس بأعمالهم : اذهبوا إلى الذين كنتم تراء ون في الدنيا ، فانظروا هل تجدون عندهم جزاء )) . [٥٩]

واتا: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەو تاوانەی کە زۆر لەسەرتان دە ترسم ئەنجامی بدەن (شیرکی یان هاوەلدانان بچووکە ..!! پرسیاری لیکرا سەبارەتی بە شیرکی یان هاوەلدانانی بچوو ؟! فەرمووی (ریاء) یان روو پەمەیی ، هەروەها فەرمووی : (خوای گەورە ) لە رۆژی قیامەتدا پاداشت بە گویرەی کردەوە کان دە دان ،برۆن بۆلای ئەو کەسانەی کە خۆیان نیشان دەدا بۆ ژیانی دونیا ، ئایا هیچ پاداشتیکیان دەست دەکەویت جگە لەوەی کە بۆ دونیا کردویانە ، ئەوانە تەنها بۆ دونیا کارو کردەویان ئەنجام داوە ، خەسارەت مەندی ژیانی دوا رۆژن چونکە کردەوی دوا رۆژیان ئەنجام نە داوە ، تەنها مەبەستیان پاداشتی دونیا بووە ..!!

---

[٥٩] _ رواه أحمد برقم (٢٣٦٨١) صصحه الالباني

ڕوون کردنەوەی ئەم فەرموودەیە :

هەر بۆیە پیغەمبەری خوا ﷺ ئۆمەتەکەی ئاگادار کردۆتەوە لە تاوانی (ریاء) یان ڕوو پەمەیی لە لای خەلك ئەنجام دانی ئەم کردەوەیە کە خاوەنەکەی ئەنجامی دەدات تەنها بۆ خەلکە خەلك پی بلین ئەو کارەی کردوویەتی کاریکی باشە ، نەوەك ئەخلاصی هەبیت لە کردەوەکانی تەنها بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە بیت ، یان بۆ وەرگرتنی پاداشتی دونیا ، بەلی ئەوەی بۆ دونیا هەر کاریك بکات (ریایی ) تیدا بیت ، ئەوا دەبیتە هۆی زیان بۆ دوارۆژی خۆی ، چونکە (ریا) ڕووپەمەی ترسناکترە بۆ سەر پیاو چاکان زیاتر لە فتنەی دەجا ، وە دەبیتە هۆی شیرك و هاوەلدانان بۆ خاوەنەکەی ، هەر بۆیە شیر هاوەلدانان دابەش دەبیت بۆ دوو جۆر : شیرکی گەورە ، شیرکی بچووگ ، شیرکی گەورە: ئەویش ئەوەیە کە کەسیك یان شتیك یەك سان بکەیت بە (خوای گەورە ) لە ناو صیفە تەکانی (خوای گەورە) بەلام شیرکی بچووك: ئەوەیە کەلە دەقەکانی قورئان و فەرموودە دا هاتووە ناگاتە ئاستی شیرکی گەورە ، وە جیاوازی نیوان شیرکی گەورە بچووك ئەوەیە شیرکی گەورە هەموو کردەوە کان پوچەل دە کاتە وە ، وە هۆکاری مانەوەی هەتا هەتایی لە ئاگری دۆزەخدا ، بۆنموونە وەك : درەچوون لە ئاینی ئیسلام هەلگەڕانەوە و نویژ نەکردن یان تارك الصلاة ، شیرکی بچووك ئەو کردەویە پوچەل دە کاتەوە کە لە گەلی دا ئەنجامی داوە وە (ریاء ) وە نابیتە هۆکاری مانەوەی هەتاهەتایی لە ئاگری دۆزە خدا ..!!

هەر بۆیە کاریك بۆ خوای گەورە نەبیت بە ئەخلاصی و دڵسۆزی ئەوا دەبیتە ڕەنج بەخەسار لەدەستدانی ئەجرو پاداشت لەسەری ، بەلکو سزاش دەدریت بە هۆی ئەو کردەویە کە ئنجامی داوە کە (ریاء) ی تیدا ئەنجام داوە لەسەری ، (ریاء ) شیرکی بچووکە و خاوەنەکەی دەباتە ناو دۆزەخەو ، هەر بۆیە دەبیت زۆر ئاگاداری کارو کردەوەی ڕۆژانەمان بین نابیت هیچ تیکەلاویەکی (ریاء) یان شیرك و دونیایی نەبیت ، چونکە نە ئەجر و پاداشتی لەسە ر وەناگریت ، بەلکو بەرەو دۆزخە ڕاپیچ دەکریت لەسە رکردەوەکەی کەئەنجامت داوە بۆ خوا ئەنجامت نەداوە بەلکو بۆ ئەوەی خەلك بیت بلین کەسیکی خیر خوازە یان چاکە کارە ، یان خوا ناسە ، خودایە لیت دە پارینەوە کردەوە کانمان بە ئەخلاصی تەنها بۆتۆ لە دڵ دەروونمان دا بچەسپینە دامەزراوامان بکە لەو کەسانەبین کە کردەوەی چاکە ئەنجام دەدن بە ئ خلاص و نیەت نیازی پاکەوە ..!!



خودایە بمان خەریتە ریزی دل سۆزانەوە .

# كاروكردەوەی پیشینەچاكە كان لە گەل ئەخلاص دا

پیشینه كان مامەله یان له گه ل ئەخلاص دا نەدە كرد ، له سەر ئەو ئایاتانەی كە دەخویندرانەوە یان ئەو فەرموودانەی كە بلاو دكرانەوە لەسەر ئەخلاص ، بەلكو مامەله كردنیان له گەل ئەخلاص جیاواز بوو ، بەلكو ژیانامەیان له گەل ئەخلاص وەك نموونەی چرایەك بوو ، چونكە زۆر چاك له گرنگی ئەخلاص و دڵ سۆزیان دا دەزانی شارەزایەكی تەواویان لە ناسینی ئەخلاص دا هەبوو ، بۆیە پیشینه چاكە كان زۆر گرنگیان بە مەسەلی ئەخلاص دا ، زۆرییش پیدا گربوون ، چونكە ماله كردنیان لە ژیانی رۆژانەی خۆیدا بی ئەخلاص دڵ سۆزی هیچ كاریكیان ئەنجام نەدەدا ، هەموو كارو كردەوەكانیان ئەخلاص یان تیدا بەدی دە كرا ، ئەم ئەخلاص و دل سۆزیە ئەوان بوو ئەم پیام و ئەم ئاینەیان پی راگەیاندی بەوەشیوەیە پوخت و ریك وپیك لەسەر ان سەری جیهاندا ئیستا ئاینە پاك بیگەردە كەمان بلاو بۆوە تەوە ، هەموو موسلمانیك شانازی بە دل سۆزی پیشنه چاكە كان دە كات ، بۆ بلاو كردنەوەی ئاینەی ئیسلام كردە وە چاكەكانی پیاو چاكان بە ئەخلاصی تەواو .

الفضيل بن عياض - رحمه الله دەلیت :(( خوای گەورە تەنها مەبەست و نیەت و ئیرادەی تۆی دەویەت )) . [٦٠]

هەروەها لە (الفضيل بن عياض ) – رە حمە تی خوای لی بیت – دە لیت : ئەوانەی درك بە گەوهەری ئەخلاص دە كەن لە نیواو خەلكیدا زۆر قورسە ، وە پرسیار كرا لە (سهل كوری عبدالله التستری ) – رەحمەتی خوا لی بیت – ئایا چ شتیك لەسەر نەفس گرانە ؟! فەرمووی : ئەخلاص ، چونكە بەشی نەفسی تیدا نیە )) . [٦١]

يوسف بن أسباط – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت: (( پاكردنەوەی نیەت و نیاز لە هەموو گەندەلی و فسادیەك زۆر توندو قورسترە لەسەر ئەوانەی هەلگەری نیەت و نیازی پاك وبیگردن ئەمە ش لە دریژ ترین كۆشش و ئەجتهادە )) [٦٢].

---

٦٠ _ مدراج السالكين (٢/ ٩٢)

٦١_ جامع العلوم والحكم (١٧) .

٦٢_ جامع العلوم والحم (١٣) .

## هەندیك نموونەی پیشینە چاكەكان لە مامەلە كردن لەگەل ئەخلاص

### یەكەم : وسف نەكردنی نەفسی خۆت بە ئەخلاص

بەلی پیشنە چاكەكان باش دەیانزانی كە ئەخلاص یان دلّ سۆزی یەكیكەلە قورسترین كردەوە كان كە رووبەرووی بەندە دە بیتەوە لە ژیانی دا ، چونكە پیویستی بە تی كۆشان جیهادیكی راستە قینە هە یە لە پیش هەر موسلمانیك دا ، ئینكاری كردن یان نەری كردنی نەفسی خۆت لە ئەخلاص ،وە یان نەسەلماندنی ئەخلاص لە نەفسی خۆ دا ..!!




لە ( هشام الدستوائی ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : سویند بە خوا ناتوانم بلیم :

هەر گیز رۆژیك نە بوو كە دوای فەرموودیەك بكەم یان قسە یە ك بكەم تەنها لە پیناوی خوا دا بووە )) .[٦٣]

ئەگەر دە تەویت بزانی ( هشام الدستوائی ) كی یە ..؟! ئەوا ئەو كەسە یە كە لەدواكردنی دا گرنگی بە نەفسی خۆی دەدا.




لە ( شعبەی كوری حجاج ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت :
(( هیچ كە سیكم نەبینیوە وەك (هشام الدستوائی ) كە دوای فەرموودەیەك بكا یان قسەیەك بكا ، تەنها لە پیناوی خوا دا بووە )) .

---

٦٣_ تاريخ الإسلام (١٧٥/٣).



له ( شاذ بن فياض ) ده لیت :(( (هشام الدستوائی )

ئەوەندە گریا ، هە تاکو چاوە کانی خراپ بوونی یان تووشی زیان هات )).

له (هشام الدستوائي ) – ره حمه تی خوای لی بیت – ده لیت : (( ئه گەر چرای رووناکی وون کرد ،

ئەاو بیر له تارکی گۆره کەت بکەوە یان قبره کەت بکەوە )) .

هەر له (هشام الدستوائی ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت :

(( سەیرم به خەلکانی جیهان دەیت ..؟! چۆن پیده کەنن ..؟! )) .[٦٤]




له (سفیان ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت :

(( من چارەسەری هیچ شتیکم زۆر به توندی نەکردوە تەنها نیەت نەبیت ، چونکه هەلگەرانەوەیە لەسەری )) .[٦٥]

---

٦٤تاريخ الإسلام (١٧٦/٣) .

٦٥_ الاخلاص والنية (٦٥).

له (يوسف كورى الحسين ) – رەحمەتی خوای لی بیت – بەنرخترین یان ئازیزترین شت له دونیا دا ئەخلاص یان دل سۆزیه ، وه چەند تی كۆشان بەكەیت له نەمانی یان دابەزینی (ریاء ) له دل و دەروونم دا ، وه ك ئەوه وایه رەنگیكی تر بروینم )).[٦٦]

وەك ئەم نزا و پارانەوەی ( مطرف كوری عبدالله ) – رەحمه تی خوای لی بیت – :

(( اللهم إنى أستغفرك مما تبت إليك منه ثم عدت فيه ، واستغفرك مما جعلته لك على نفسي ثم لم أوف لك به ، واستغفرك مما زعمت أنني أردت به وجهك فخالط قلبي فيه ما قد علمت ))[٦٧]

[٦٦]_ مدارج السالكين (٢/٩٢) .

[٦٧]_ حلية الأولياء (٢/٢٠٧) .

## دووەم : شاردنەوەی کردەوە






**لە ( حسنی الصبری ) – رە حمە تی خوای لی بیت – یەکیکە لە ووتا درە شوینکەوتووە کان ، لەسەر تی کۆشانی پیشینەکان لە ، شاردنەوەی کردەوە کان ، دەلیت :**

**(( وە ئەگەر پیاویك قورئان کۆبکاتەوە یان بخوینیتەوە ، دراوسیەکەی هەستی پی بکات ، یان پیاویك زانستیکی شەرعی زۆر هەبیت خەلکی هەستی پی بکات ، یان پیاویك نویژیکی دریژ بکات لە مالەوەدا میوانەکەی هەستی پی بکات ، دەرك کردن وتی گەیشتن لەو خەلکانەی سەر زەویە ، لە کارو کردەوە کانیاندا توانای هەلگرتنی کاری نەهینی هەیە وە بەنیهنی ئەنجامی دەدن ، هەرگیز بە ئاشکرا کارو کردەوە ناکەن ..!! وە کاتیك موسلمانان تی دە کۆشیت بۆ نزا پارانەوە لە (خوای گەورە ) دا ، دبیت تەنها خۆی گوی لی بیت ، بەدەنگیکی نزم و لە سەر خۆبیت لە نیوان خۆی و (خوای گەورە ) دا ) .** [68]

**هەر وەك (خوای گەورە ) دە فەر موویت :** ﴿ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾ الاعراف ٥٥.

[ ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ] ئێوە لە خوای گەورە بپاڕێنەوە بە زەلیلی و ملکەچی وە بە نهێنی نەك بە دەنگی بەرزو هاوار کردن [ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ (٥٥) ] بەڕاستی خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێ کە سنوور ئەبەزێنن لە پاڕانەوەندا، وەکو داواکردنی کۆشکێکی سپی لەلای راستی بەهەشت، یان داوای شتێکی وا بکەن کە مافی ئەوان نەبێت، یاخود دەنگ زۆر بەرز بکەنەوەو هاوار بکەن لە کاتی پاڕانەوەدا.

---

[68] _ الزهد لابن المبارك (٤٥_٤٦).

## سی یه م : شاردنەوەی کردەوە لەلای ماڵ و خیزان و کەس کار دا :




(صام داود بن ابی هند ) – رەحمەتی خوای لی بیت –

(( چل سال خیزانه که ی ، پی نەزانی ، که کولیرەیەکی نانی هەلده گرت بەریگا دا ده رۆیشت و دەکردە صەدەقەو خیر دەی بەخشیەوە ، دوا تریش ئیوارە دە گەرایەوە ومالەوە نانی لە گەل دە خواردن فتاری لە گەل دە کردنەوە )) [٦٩].

## چوارەم : شاردنەوەی گریان :



لە ( الحسن البصری ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت :

((من دەرگم بە پیاویك کردبوو ، ئەو پیاوە سەری لە گەل هاوسەرەکەی دا بوو لە سەر یەك بالیفدا ، لەسەر کولمەی پر بوون لە فرمیسك ، کە چی هاوسەرەکەی هەستی پی نە دەکرد ، من درکم بەم پیاوە کردووە کە لە ریزی ئە و کەسانە بوو کە فرمیسکی دەرژا بی ئەوەی هیچ کە سیك لە تەنیشتیەوە هەستی پی بکات )) .[٧٠]



[٦٩]_ حلية الاولياء (٣/٩٤ ).
[٧٠]حلية الاولياء (٢/٣٤٧).

## پێنجەم : شادرنەوەی زانست و علمی شەرعی نەک خۆپی بەدەرخستن:




(ابن فارس) ده گیرتەوه له ( أبی الحسن القطان ) – رحمه تی خوایان لی بیت – ده لیت :

(( بینینم تووشي ئازارو ئیش بوو یان گز بوو ، وا گومان برد  بۆ زۆری ووتەکانمە یان قسەکانمە لە کاتی گەشتە کانمدا ، وا گومانم برد هۆکاری نەخشی چاوه کانم بەهۆی بلاو کرنەوەی یان ئاشکرا کردنی زانست علمه کەمە )).




له ( الذهبي ) – رحمه تی خوای لی بیت – ده لیت :

(( والله راسته ، ئەوان لە گەل مەبەست باشی و وە نیەت و نیازیکی  تەندروست بوون زۆر بەی کات ، ترسیان له قەسه کردن ووتەکانیان بوو لە نیشاندانی زانست و فەزیلەتیاندا ، کەچی ئیستا زۆری ووته و قەسه کردن هەیه ، بەلام کەمی زانست و زانیاری و وه خراپی مەبەست و نیەت ، پاشان خوای گەورە  ئەم ئابروو جونەیان ئاشکرا ده کات ، شەپولی نەزانین و هەواو ئارەزوو گیژاو و تیکچوونی ئەوان ده بینریت کە فیریان کردووە ، واتە : فیرکردنیان نا تەندروست دەبیت )).[٧١]



خۆ هەلکیشان بە علم و زانست کەچی دەبیتە (رياء ) بۆ خاوەنەکەی ....

٧١_ سیر أعلام النبلاء (١٥/٤٦٤_٤٦٥).

## شه شه‌م : شاردنه‌وه‌ی خیرو صه‌ده‌قه به شاراوه‌ي یان له شه‌و دا :




(زین العابدین علی کوری الحسین ) – ره حمه تی خوای لی بیت –

(( شه‌وانه نانی به پشتیه‌و هه‌له گرت ده گه‌را به‌دوای فه‌قیر هه‌ژراندا له شه‌ویکی تاریکدا ، هه‌روه‌ها ده‌ی فه‌رموو: خیرو صه‌ده‌قه له شه‌ویکی زۆر تاریکدا ، ده بیته کوژانه‌وه‌ی تووره یی په‌ر وه‌ردگار ، وه خه‌لکی له شاردا بژیویان بۆ ده هات یان رزق رۆزیان پی ده گه‌یشت له شه‌ویکی تاریکدا ، که‌چی هه‌ژاره کانی خه‌لکی شار نه یان ده زانی ئه‌و بژیویه رزقه یان له کو پی ده گات ..!! له کاتیك دا (زین العابدین علی بن الحسین ) کۆچی دوای کرد..!! خه‌لکی شار ئه‌وه‌ی شه‌وانه رزق و رۆزی به‌ده‌ست ده گه‌یشت له ده‌ستیان چوو نه‌ما ، به‌لی ئه‌وان کاریگه‌ریه که‌یان بینی ، به‌وه‌ی تاقی ده کرنه‌وه ئاردی بۆ ده گواستنه‌وه له شه‌و دا ، وه ده‌ی برد بۆ نزیکه‌ی سه‌د مالی پی ئاوه دان ده کردوه ..!! )).

به‌لی ئه‌م جۆره کاور چیرۆکانه له گه‌ل خاوه‌نه کانی دا ، نیازیان وایه که کارو کرده وه که‌یان بشارنه‌وه نیشانی نه‌دن ، به‌لام هه ر (خوای گه‌وره) نیشانی ده‌دا بۆ خه‌لکی و کرده‌وه که‌شی لی قبول ده کات ، چونکه به ته‌نها ئه‌خلاص و نیازی ته‌واوی ره‌زامه‌ندی (خوای گه‌وره ) یه به‌ته‌نها ، (خوای گه‌وره) کرده‌وه‌که‌ی به‌رز ده‌نرخینیت لی وه‌ر ده گریت .!!

هه‌روه ك (خوی گه‌وره ) ده‌فه‌رموویت : ﴿ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾ الفرقان ٧٤ .

واتا : وه بمانکه به پێشه‌وا بۆ ئه‌و که‌سانه‌ی که ته‌قوای خوای گه‌وره ئه‌که‌ن و له چاکه‌دا خه‌ڵکی چاومان لێ بکه‌ن.

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویت : ﴿ وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا ﴾ الانبياء ٧٣ .

واتا: وه کردیانمان به پێشه‌واوبه ڕێنمایی ئیمه‌هیدایه‌تی خه‌ڵکیان ئه‌دا وه خه‌ڵکی شوێنیان ئه‌که‌وتن .

## ئەو کەسانەی کە نشیانەی ئەخلاص یان تیدا بەدی دەکریت

بەدەرکەوتنی نیشانەکانی ئەخلاص لەسەر بەندەی مخلص یان دڵ سۆزدا زانیان چەند نیشانەیەکیان کردۆتە پیوە بۆ ئەو کە سانەی کە ئەخلاص یان تیدا بەدی دەکریت ئەمانەی خوارەوە :

- حەز نەکردن بە شوهرت و نابانگ دەرکردن .
- حەزنە کردن بە پیدا هەلدان و مەدح و ستایش و ریزلینان .
- پەرۆشی کارکردنی بۆ ئاینە کەی .
- دست پیشخەری بۆ کردەوەی چاک بەهیوای وەرگرتنی ئەجرو پاداشتە .
- ئارام گرو خۆ گرە لە کارو کردەوە کانی دا .
- حەز بە گەلە یی و سکالا کردن ناکات بە بەردەوامی .

- ئاگادارە یان پێداگرە لە سەر شاردنەوە کارو کردەوە کانی دا .

- وورد بین و ووریا لە کاردنی بە نهێنی .

- زۆربەی کارو کردەوە کانی بە نهێنیە .

- کارو کردەوەی نهێنی پێی گەورە ترو خێر ترە لە کارو کردەوەی بە ئاشکرا .

- هەموو کارو کردەوە کانی تەنها بۆ (خوای گەورە ) یە .

ئەوانە هەر هەمووی نیشانە کانی ئەخلاص یان دڵ سۆزیە ، بەڵام دەبێت ئەی برای موسلمان ئەی خوشکی موسلمان هۆشداری بێت بۆت چونکە ئەو کەسەی کە شاهید حالی دڵ سۆزی خۆی بێت ، ئەوا دڵ سۆزی تێدا بەدی دەکریت ، چونکە دڵ سۆزی بۆ خۆت پێویستی بە دڵ سۆزی تەواو هەیە بۆ (خوای گەورە ) ئینجا دە بیتە دڵ سۆزی تەواو و دامەزراو بە نیەتی پاک و نیازی پاک تەنها بۆ خوا . جا لە (خوای گەورە ) دوا کارم ئیمە و ئیوەش بخاتە ریزی دڵ سۆزانەوە ، لە (خوای گەورە ) دوا کارم دڵ دە روونمان پاک بکاتەوە لە کردەوەی (ریاء ) و دوو رووی دا ..!!



خودایە هەموو کارو کردەوە کانمان بە ئەخلاصەوە لی وەرگرە .

# ئایا ئاشکرا کردنی کارو کردەوەکان لەرووی شەرعەوە ریگە پی دراوە؟!

لە پیشدا باسمان کرد کە پیشنە چاکەکان چۆن ئاگادارو وریا بوون لە سەر نهینی کارو کردەوەکاندا ، وە باسی نیشانەکانی دڵ سۆزیمان لە نهینی کارو کردەوە کاندا ، وە ئیستاش باسی ئەوە دە کەین کە چۆن ئاشکرا کردنی کارو کردەوە کان لە رووی شەرعیەوە ریگە پیدراوە ، وە ك دەووتریت: باشترین کردەوە بە نهینی بکریت چاکترە ئەفزەلترە لە ئاشکراییی ..!!



لە ( ابن قدامە ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دە لیت :



((بابەت و لە بەیانامەدا مۆلەت پیدراوە بۆ مەبەستی ئاشکرا کردنی پەرستنە کان دا ))

هەروەها دەلیت : (( لە ئاشکرا کردن وبیان کردن دا سوود دە گەینی بۆ راکیشانی خەلك بۆ خیرو چاکە کردن ،وە لەم کردەوانەی کە نابیت بە نهینی ئەنجام بدریت ئەویش ئەمانەن: کە حەج کردنی مالی خوا ، جیهاد و تی کۆشان ، وە ئاشکرا کردنی ئەمانەش پیویستە چاودیری کردنی دڵ دەروونت بی لەوەی کە حەز نەکەیت (ریاء ) بە شاراوەی تیدا ئەنجام بدری ، بە لکو بە نیاز مەبەستی پاك کردە وە کە ئنجام بدەیت )).

هەروەها دەلیت : (( مرۆڤی لاواز نابیت فریوی یان فیل لە نەفسی خۆی بکات ، وەك ئەوەی کە شاکرای دەکات یان نیشانی دەدات بەلام بە خۆی لاوازە ، وەك ئەوەی لە مەلە کردن دا لاوازە شەپە شەپ دەکات ، کە سەیری کۆمەلیکی خنکاوی کرد رەحم وبەزەی پیدا هاتەوە ، هەر بۆیە هاتە خۆی بەوان چەپساندو بۆ ئەوەی رزگاریان بکات ، بەلام هەموویان خەنکان)) . [٧٢]

---

[٧٢] مختصر مناهج القاصدين (٢٢٣-٢٢٤).

به ئاشكرا كردن و به نهينى كردنى كار كرده وه كان له چەند بارو دۆخيك دايه :

**يەكەم :** ئەگەر كار كردەوه كه و عيبادەتەكه سنه بيت ، ئەوا دەبيت به نهينى ئەنجامى بدەيت وەك شەو نويژ كردن ترسان له (خواى گەورە ) له كاتى ئەنجامدانى شەو نويژ كردن دا ..!!

**دووەم :** ئەگەر كارو كردەوه كه و عيبادەتەكه سنه بيت ئاشكرابيت ، دەبيت ئاشكرايى بكەيت وەك پاراستنى له سەر نويژى جمعه يان هەينى و يان نويژى به كۆمەل ، پيويسته ئاشكرا بيت به حەق لەسەر بەندە واجبه .

**سى يەم :** ئەگەر كارو كردەوه كه يان عيبادەكه له نيوان ئاشكرا كردن و نهينى بيت ، ئەوا سنه يه دەبيت به نهينى بيت ، له بەر ئەوەى له نەفسى خۆت بترسيت له (ريياء) كردن ، وه ئەگەريش كارو كرده وه ك سوود گەياند بيت به خەلك ئەوا سنه يه ئەگەر (ياء ) تيدا نەبيت ئەو ئاشكرا بيت بۆ سوود گەياندن بەخەلك .

**چوارم :** خيرو صەدەقه بەخشين ، ئەگەر وا گومانت برد كەوا (ريياء) چووته نيو دلّ و دروونتەوه ، كه خەلك ببينى له و كارو كردەوەيه ئەوا دەبيت له ترسى (ريياء ) به نهينى ئەنجامى بدەى ، ئەگەريش خەلكى سووديان لى بينى و چاوى له تۆ كرد له خير كردن و صەدقه كردنه دا ، تۆش تى كۆشانت كرد له گەل نەفسى خۆت دا دوور كەويتەوه له (ريياء) ئەوا بۆ سوود وەرگرتنى خەلك سنه يه ئەگەر ئاشكرا بيت خير صەدەقه كه دوور له (ريياء ) كردن جيهادى نەفس له (ريياء ).



خوا دايه دوورمان كەى له (ريياء ) بازى روو پەمەيى كردن

**پینچەم :** وەهەندیك لە زانایان یان ووتار خوینانی مەزگەوتە کان هەندیك لە سنە تەکان ئەجامدەدن بۆ ئەوەی خەلکی فیر سنەتەکان بکەن ،وە سنەتی نوافل لە مەزگەوتدا وەکو رواتبە کان سنەتی نویژی ئەستخار ە یان سنەتی نویژی ووترە یان فیر بوونی سنەتی نویژی جنازە ، یان سنەتی نویژی رۆژ گیران چەندی سوونەتی ، ئەمانە شیخ یان ووتار خوین یان زانا یەکی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە مەزگەوتدا ئەنجامیان دەدا بۆ زیاتر شارەزا بوونی رکعاتەکان زانینی سنەتەکانە ، هەر وەك هەندیك لە پیشینە چاکە کانی سلف ووتویانە : هەندیك لە کردەوە چاکەکان پویستە بە ئاشکرا بکریت ، ئەوە ش بۆ سوود گەیاندو زیاتر شارە زابوونی موسلمانان ..!!






لە (أبو بكر بن عياش ) بۆ کورە کەی دەلیت :

(( ئەی کوری شرینم هەر گیز سە پیچی فەرمانە کانی (خوای گەورە ) لەم ژوورە دا ، من دوانزە هەزار جار ختمی قورئانی پیرۆزم کردووە )) .[٧٣]

بی گومان ئەم بۆ ئەوە نیە کە خۆی بەدرخات بەلکو بۆ ئاگادار کردنەوەی کورە کەی تی بۆ ئەوەی بزانیت کە باوکی ئەم کارو کردەوەیە چاکە ئەنجام دەدات بۆ ئەوەی (خوای گەورە ) لی خۆش بیت ، بۆ فیر کردنی کورە کەی تی لەسەر ئەم ریچکە براوت بەلکو وەك باوکی ئەهلی قورئان بیت ، لە خوا برتیست ، هەستیك بە کارو کردەوەی چاکە تاکوئەجر و پادشتی دەست کەویت لە قیامەتدا ، بی گومان ئەم جۆرە دەرکەتنە یان ئاشکراکردنی عیبادەتەنە (ریاء) نیە بەلکو بۆ ئاگادار کردن فیر کردنی کورەەی بە ریگای راست و دروستی قورئانی پیرۆز ..!!



---

[٧٣]_مناهج القاصدين (٢٢٤).

## لیرەدا شتیك دە خەینەروو كە دەبیت ئاماژای پی بكریت یان ئاگاداری بین :

ئەمەش ئەوە یە كە پیوەندی بە بیندەنگی هەیە لە هەموو كارو كردەوە چاكە كان دا وە لە نیوان هەموو خەلكیدا ، چونكە مرۆڤ پیس مەبەستی پی مردنی ئیسلامە ، هەروەك دوو رووە كان ئەگەر بینیا خیرو صەدەقەی گەورە دەكەیت ، ئەوا دەلین : ئەوە دوو روویە ، ئەگەر بینیان خیرو صەدقەی بچووك دە كەیت ئەوا دەلین : خودا لە م كارە تاندا دەولە مەندە ، چونكە هەموو ئامانجی دوو رووە كان ئەوەیە كە كارو كردەوەی چاكە ئەنجام نەدریت لە نیو كۆمەلگای ئیسلامی دا ، تا وەكو پیاو چاكان بخشەكەرانی ریگا ئیسلام سوودو پاداشتیان دەست نەكەویت لە ناو خەلكدا ..!!

بی گومان دەبیت ریگای خیرو كردەوەی چاكە تیدا هەلبژیریت ، وە خۆ گرو ئارام گر بیت لە بەرانبەر ئازاردان ریگری كردنی دوو رووە كان ، وە هیچ كان خۆت نەخەیتە لای دوو رووە كان و ، چونكە (خوای گەورە ) دەزانیت كە چاكەیەكی چەند گەورەیە ئەو كەسە یكە بەئخلاص نیەت پاكی ئەنجامی دەدات تەنها بۆ خوای ئەنجام دەدات ..!!




لە (الفضیل كوری عیاض ) – رە حمە تی خوای لی بیت – دە لیت :

(( وا هینان لە كارو كردەوەی چاكە لە پیناوی خولكیدا ، ئەوا (ریاء) یە ، وە كارو كردەوەی چاكەش لە پیناوی خەلیكیدا ، ئەوا شیرك و هاوەلدانانە ، دلّ سۆزیش یان ئەخلاص ئەوەیە كە (خوای گەورە ) لەم دووانە بتپاریزیت ..!!)) .[٧٤]




لە ( الامام النووی ) – رحمە تی خوا لی بیت ) دە لیت :

(( ئە گەر بەندە ویستی لە سەر عیبادەت و كردەوەی چاكە بیت ، ئەوا وازی لی بهینیت لە ترسی بینینی خەلكدا ، ئەوا ئەو كە سە دوو رووی دەكات )) .

---

[٧٤]_ مدراج السالكين (٩٢/٢ ) .

## جیاوازی نیوان (ریاء) یان خۆنمایش کردن هاوبەشی رەها لە کارو کردەوە دا :

(ریاء ) یان خۆنمایش کردن : ئەوە یە کە پیاویك کردەوەیەکی شەرعی ئەنجام بدات ، مەبەستی پی رازی بوونی خەلك بیت نەوەك لە پیناوی (خوای گەورە ) دا بیت .. ! !



هاوبە شی دانان لە کارو کردەوە دا : ئەوەیە کە پیاویك کردەویەکی شەرعی ئەنجام دە دات ، مەبەستی پی رازی بوونی خەلك لە هەمان کاتدا (خوای گەورە ) لی رازی بیت ، واتە خەلك هاوبەش بکات لە گەل (خوای گەورە) دا واتە: نیەت و نیازی پی رازی بوونی خەلك و خوای گەورە تیدا هاو بەش دەکات ..!!



یان خۆ نمایش کردن بۆ خەلك  بە کارو کردەوە ی چاکە و عیبادەت کردن ، وینە گرتن و فیدو کردنی بلاو کردنەوە لە تۆرە کۆمەلایەتیە کاندا ، خۆ دەر دەخەن کردەوەی چاکە ئەنجام دەدن ..!!



**له بەشی یەکەم** : ئەگەر پیاویك كاریكی چاكە ئەنجام بدا لە پیناوی خوا دا بیت ، نابیت رووی بسورینیت بۆ غیری (خوای گەورە ) واتە نابیتە هاوبەشی بكات لە كارو كردەوە كانی دا لە گەل (خوای گەورە ) دە بیت تەنها بۆ خوا ئەنجامی دا بیت ، ئەمەش لە باشترین و بەنرخ ترین كارو كردەوە گەورە كان و فەزلی زۆرە ..!!



**بە شی دووەم :** ئە گەر پیاویك كردەویەكی چاكە ئەنجام بدات لە پیناوی خوادا ، دە بیت رووی بسوورینیت بەمەرجیك كە نیەت و نیازی پاك بیت .

بۆنموونە بلی : رۆژوو دەگرم لە پیناوی خواد لە پیناوی پاراستنی تەندروستی خۆم دا ئەو ریگە پیدراوە بەلام نیوەی ئەجرو وپاداشتی رۆ ژووە كەی دەست دەكەویت .



یان بۆ نموونە بلی : من گەشت دە كەم بۆ حەج و عەمرە یان بۆ مالی خوا بەلام نیەت مەبەستی بازرگانی بیت ، ئەوا درورسە رووی بسوورینیت یان درەستە گەشتە كە بكات هەم زیارەتی مالی خوا هەم بازرگانی كردن لە گەشتە كەیدا ، بەلام ئەجرو پاداشت وەرگرتنی بە قەد ئەوە نیە تەنها لەپیناوی خوادا ئەنجامی دا بیت نیوە پاداشت وەردەگریت .



یان بۆ نموونه: بلی : من جیهاد و تی کوشان ده کەم له پیناوی خوادا ، له هەمان کاتدا مەبەستی دەست کەوت و غنیمەتی جەنگە ، ئەوا درەستە رووی بسورینیت ، چونکە نیەت و مەبەستی رازی بوونی خوایە و دەست کەوتی جەنگە بەلام نیوه یئەجرو پاداشت وەردەگریت لەسەری چونکە بە تەنها لە پیناوی خوا دا جیهاد تی کۆشانی نەکردووه ، بۆیە نیوەی پادشتی و ئەجر وەردەگریت لەسەر ئەم کارو کردەوە یە کە ئەنجامی دا وە ..!!



یان بۆنموونە بلی : من دەرۆم بۆ مەزگەوت لە پیناوی خوادا ، لەهەمان کاتدا مەبەست و نیەتی ئەوەبی بە پی رۆیشتن تەندروستە وە ك وەر زش کردن وایە ، ئەمەش دروستە رووی بسوورینیت ، نەنیەت و مەبەست ی عیبادەت کردنە بەلام بۆ تەندروستی ئەو کەسە باشە رۆیشتن مەبەستیەتی ، بەلام ئەمە نیوەی ئەجرو پاداشت وەردە گریت لەسەری ، چونکە تەنها لە پیناوی رەزامەندی خوای گەورە دا ئەم عیبادەتەی ئەنجام نەداوە ، بەلکو بۆ تەدەرستی خۆشی ئەنجامی داوە.



**به شی سی یه‌م :** ئه‌گه‌ر پیاویك كرده‌وه‌یه كی چاكه ئه‌نجام بدا ، عیباده‌ت كردنیك بۆ (خوای گه‌وره ) ئه‌نجام بدا وه رووی بسوورینیت بۆ فه‌رمانیك كه‌چی له راستی دورست نیه قه‌ده‌غه‌یه رووی تیدا بسوورینیت ..!! مه‌به‌ستی پی پیدا هه‌لدان ستایش كردن بیت له لایه‌ن خه‌لكه‌وه ، یان مه‌به‌ستی پی به نویژ كردن و یان قورئان خویند ، مه‌به‌ستی وه‌رگرتنی پاره مال و سامان پی واته بازرگانی كردن به ئایه ته‌كانی خوای گه‌ور بكات له لایه‌ن خه‌لكه‌و مه‌دح و ستایش بكریت و مال و سامان به‌م كرده‌ویه كۆ بكاته‌وه كه ئیستا زۆر باوه له نیو كۆمه‌لكای كوردی دا خوینه‌وه‌ی قورئانی پیرۆز له كاتی پرسه كان دا ، یان نویژ كردن بۆ ئه‌وه‌ی بلین كه‌سیكی پیاو چاكه ، ئه‌مه‌ش ده‌بیت كرده وه‌یه‌كی زۆر ترسان بۆ خاوه نه‌كه‌ی دا ئه‌گه‌ر مه‌به‌ستی پی پاره كۆ كردنه‌وه مه‌دح و ستایش بیت ، ئه‌وا كرده‌وه كه‌ی فاسده ده‌بیت به‌تال ده بیته‌وه وه‌رناگیریت به‌لكو سزاشی له سه‌ر وه‌ر ده‌گریت ، به‌لام ئه‌گه‌ر له كاتی ئه‌نجامدانی كرده‌وه كه هه‌ستی كرد خه‌لك مه‌دح ستایشی ده‌كه‌ن یان له به‌رانبه‌ر دا مال پاره ی بۆ كۆده‌كه‌نه‌وه ، ئه‌وا یه‌ك سه‌ر ده‌ست هه‌لگری ئه‌وا ده‌بیته جیهاد بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی ، به‌لام ئه‌گه‌ر رازی بوو ، ئه‌وا كرده‌وه‌كه‌ی فاسده به‌تال ده‌بیته وه ، به‌لام ئه‌گه‌ر تموحو رغبه‌ت و حه‌زی كرد كه مه‌دح و ستایش بكریت له‌به‌رانبه‌ردا مال و سامان كۆ بكاته‌وه ، وه خه‌لك پی سه‌رسام بن ، ئه‌وا كرده‌وه كه‌ی ده‌بیته (ریاء ) یان خۆ نمایش كردن ، بی گومان ئه‌م كرده‌وه‌یه به‌تال ده بیته‌وه فاسد ده‌بیت ..!!



وه ئه‌م جۆره كرده‌ویه كه مرۆڤ بۆ مه‌دح ستایش ئه‌نجامی ده‌دا




بی گومان هه‌موو ئه‌م كرده‌وانه فاسدو به‌تال ده‌بیته‌وه

**بەشی چوارەم :** ئەگەر بەندەیەك مەبەستی لە كردەوەیەك كە دواى لى بكريت بيكات لە گەل ئەوەى روو نەسووراندى بۆ ئەجرو پاداشتی شەرعی ، بۆنمونە: بەرۆژوو بيت تەنها لە پياوی ئەوەی كە رجيم بكات بۆ تەندروستی باشە ..!! يان جيهاد بكات تەنها بۆ مەبەستی دەست كەوت مال سامان و غەنيمەت ..!! وە يان زەكات لە مالە كەی دەركات تەنها بۆ گەشەكردنی مال سامانەكەی ..!! ئەمانە هەر هەمووی كردەوەی بە تال فاسدە ..!!

(خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا ﴾ الاسراء ١٨ .

واتا: [ مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَنْ نُرِيدُ ] هەر كەسێك لە ژيانيدا مەبەستی دونيا بێت و بۆ دونيا هەوڵ بدات ئەوە ئێمەش بۆ هەر كەسێك كە ويستمان لێ بێت و بمانەوێت بۆی پێشئەخەين و لە دونيادا پاداشتی ئەدەينەوە [ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلَاهَا مَذْمُومًا مَدْحُورًا ] بەڵام پاشان لە ڕۆژی قيامەتدا دۆزەخمان بۆی داناوە كە ئەچێتە ناويەوە كەزەمكراوەو دەركراوەو دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوای گەورە.

**بەشی پينچەم :** ئەگەر بەندە يەك مەبەستی لە كردەوەيە كە دواى شەرعی لی نەكريت ، لە گەل روونەسووراندى بۆ دوا كردنی رازی بوونی (خوای گەورە ) كە پيشتر نويژی دە كرد تەنها بۆ خۆنمايش كردن يان خۆی پيشانی خەلك دا تەنها ، ئەوا خاوەنی ئەم كردەوەيە كار كردەوەيە كەی بە تالە و فاسدە تەنانەت تيدا گوناه باريش دە بيت ..!!



وە ئەم وينەيە كردەوەيەكی زۆر فاسدو نمايش كردنەبۆ خەلك

## درۆكردن و دوور كەتنەوە لە خۆنمايش كرد يان (رياء )

بى گومان ئەم كردەوەيە سەرزەنشت دەكريت ، چونكە هەنديك لە موسلمانان بير لە درۆكردن بكەنەوە بۆ ئەوەى لە خۆنمايش كردن (رياء ) رزگاريان بيت ، وە ئەوە هەلە يەكى زۆر ترسناكە ، وە كردەوەيەكى قيزە ون فاحيشەيە ، چونكە درۆ كردن هەرگيز هيچ رەوشت و ئەخلاقى موسلمان نيە ..!!

هەروەك دروست كردنى مەزگەوتيك يان قوتابخانەيەك لە پيناوى خوادا دورستى دەكات ، لە پاشان دا پرسيارى لى دە كريت ، ئەويش دەليت : ئەو مەزگەوتە يان ئەو قوتابخانەيە هى فلانە كەسە ، كەچير بەخۆى دروستى كردووە درۆى لەسەر دەكات ، كەچى درۆ كردن سيفەتى موسلمان نيە ..!!

لە ( محمودى كورى لبيد ) ، لە (عثماني كورى عفان ) – خوا لە هە ردوو كيان رازى بيت – دە ليت: ((أَرَادَ بِنَاءَ الْمَسْجِدِ، فَكَرِهَ النَّاسُ ذلكَ، فأَحَبُّوا أَنْ يَدَعَهُ علَى هَيْئَتِه، فَقالَ: سَمِعْتُ رَسولَ اللهِ ﷺيقولُ: مَن بَنَى مَسْجِدًا لِلَّهِ بَنَى اللَّهُ له في الجَنَّةِ مِثْلَهُ )) .[75]




واتا: عوثماني كورى عفان ، ويستى مەزگەوتيك دروست بكاتەوە ،

خەلكى ئەوە يان پى ناخۆش بوو ، حەزيان دەكرد وەكو خۆى بمينيتەوە ،

بۆيە ووتى : من لە پيغەمبەرى خوام ﷺ بيستووە ، فەرمووويەتى :

هەركەسيك مەزكەوتيك بۆ خوا دروست بكات ، ئەوا (خواى گەورە )

لە بەهەشتدا بە وينەى ئەم مەزگەوتە بۆ دروست دە كات ..!!

---

[75]_ صحيح مسلم برقم (٥٣٣) .

## هەندیك شت یان كردەوە گومانی دەبیت كە (ریاء) یان خۆنمایشكردنە بەلام لەراستی دا (ریاء ) نیە

ئەگەر خەلكی لەسەر كاریكی خێر مەدح ستایشی تۆیان كرد، بەلام تۆ نیەت مەبەست نەبوو لە مەدح ستایش كردنەكە ، بی گومان ئەوا موژدەیەكی بە پەلە كە تۆ ئیمانداریكی راستە قینەی ..!!

پیوە لكاندنی نازناویك یان شوهرەتیك یان لە قەبیك ،بی ئەوەی خۆت داوای بكەیت ، وەك : نازناوی زانا یان مامۆستا یان قوتابی یان پزیشك یان ئەندازیار یان پاریزە یان ئەفەسەر لە سەربازی هەر نازناویك كە مەشهور شوهەرتی تیدا بەدی بكریت بەلام ویستی خۆتی لە سەر نەبیت ، ئەم دوور لە خۆنمایش كردن (ریاء ) بازی ..!!

هەندیك لە خەلك سەری پیاویك دە كەن كە زۆر چالاكە لە سەر عیبادەت پەرستنەكانی دا ، بۆ ئەوەی خەلكی چاوی لیگات وەكو ئەم پیاوە چالاك بیت لە عیبادەت پەرستەنەكانی دا ، مەبەستی تەنها ئەوە بیت ، ئەم كردەویەش دوور لە خۆنمایش كردن (ریاء) بازی بەلكو ئەجرو پاداشتیش وەر دە گریت لەسەری ..!!

خۆ پۆشتە كردن خۆ جوان كردنی لە لەشەو بەدەن جل وبەرگ دا، یان لیدانی بۆنی خۆش ، هەموو ئەمانە دوورە لە  خۆنمایش كردن و (ریاء ) چونكە پاك خاوینی و خۆ پۆشتە كردن لە ئیمان دا یە ..!!

شاردنەوەی گوناهەكان قسە نە كردن لە سەریا ، ئەمە ش دوور لە (ریاء ) ، بەلكو ئەم كردە وەیە داواكردنی شەرع و ئاینە بۆ رووپۆش كردن یان ستر كردن لەسەر نەفسی خۆمان وە لەسەر نەفسی كەسانی تریش دا ، وەهەندیك لە خەلكی پیان وایە ئەو هەواله یان ئەم گوناهە ئاشكرا بكەن ، بۆ ئەوەی پیان بلین مخلیصە یان راست گۆیە ، بەلام ئەو گومانە باش نیە تاوانە بۆ كەسە كە خۆی چونكە خوای گەورە تاوانەكانی روو پۆش كردووە یان ستر كردوە پیویست ناكان خۆی ئاشكرایان بكات ، هەرچەند شەیتانی مەلعون كردەوەیە بۆ دەرازینتەوە بۆ ئەوەی ئاشكرای بكات ، بەلام نابیت موسلمان ئەوەندە لاواز بیت شەیتان زەفەری پی ببات ، چونكە ئاشكرا كردنی گوناهەكانت یان هەوالدانی گوناهەكان دەچیتە بابەتی بلاو كردنەوەی خراپە كاری فاحیشەی قیزە ون لەنیوان ئیمانداران دا ..!!